# لەژێر سێبەری قورئاندا

## (جوزئی یەکەم)

بە پێنووسی

سەید قوتب

کورتکردنەوەو وەرگێڕان

شیروان عەبدولڕەحمان

چاپی دووەم / هەولێر
١٤٣٥هـ / ٢٠١٤ز

# له ژێر سێبەری قورئاندا

{ جوزئی یەکـــەم }

( جوزئی فاتیحه )

به پێنوسی

سـەید قوتب

وەرگێڕانی

شـیروان عەبدولڕەحمان

١٤٣٥ ك ٢٠١٤ ز

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

**وتەیەکی پێویست ....**

ئەم شاکارەی بەردەستان بەناوی (في ظلال القرآن) (لە ژێر سێبەری قورئاندا)یە کە بە پێنوسی بیریارو ئەدیبی بە ناوبانگی میسری مامۆستای خوالێخۆشبوو (سەید قوتب) نوسراوەو بریتیە لە سەرنج و تێبینیەکانی خۆی دەربارەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بەبێ ئەوەی ناوی بنێت تەفسیری قورئان، بەلام لەناو خوێنەرانیدا هەر بە (تەفسیری فی ظلال) ناسراوە .. واشئەزانم ئەم پیاوە زۆر لەوە بەناوبانگترە من لەم سەرەتایەدا بەخوێنەری رێزداری بناسێنم[*] .. ئەوەندە نەبێت کە بلێم زۆر دڵسۆزی ئەو رێبازەی بوە کە هەڵیبژاردبوو بۆ بەرنامەی ژیانی خۆی و بەهەموو توانایەوە لە خزمەتیدابوو، تا گیانی خۆشی کردە قوربانی ئەو رێبازە، بۆیە بەرهەمەکانی زیندوون و بۆ چەند نەوەیەکی داهاتووش ئەبنە سەرچاوەو توێشووی فیکری و نموونەی بەرزی دڵسۆزی و خواویستی لە ژیاندا ...

چەند ساڵێک لەمەوبەر و دوای ئیستیخارەکردن بڕیارم دا هەوڵبدەم بۆ بەکوردیکردنی ئەم شاکارە گرانبەها جیهانیە، ئەوەبوو لە بەرگی یەکەمەوە دەستم پێکردوو بەشی (جوزئی) یەکەمی قورئانم تەواوکرد - کە سورەتی (الفاتحة) و چلو هەشت ئایەت لەسورەتی (البقرة) دەگرێتە خۆ - بەلام هەربە رەشنووسی مایەوەو بەسەرهاتەکانی ژیان و هەندێ کەمتەرخەمیش وایانکرد کە چاپکردنی تا کاتی ئێستا دوابکەوێت .. سوپاس بۆ خوای بەخشندە کە ڕێگای

---

[*] بۆ زیاتر ئاشنا بوون بە ژیاننامەو زانیاری پتر لە مەڕ بەرهەم و تواناکانی ئەم نوسەرە بڕوانە کتێبی زۆر بە پێزو گشتگیری توێژەرو نوسەر : سەلاح عەبدولفەتاح ئەلخالیدی، بەناوی (سید قطب من الميلاد الى الأستشهاد) .. ئەم کتێبە لە لایەن هێژا (طارق نجيب رشيد) کراوە بەکوردی ...

بۆ ئاسانكردم  كەمێك خزمەتی پەيامە مەزنەكەی بكەم بە تايبەتيش خزمەتی قورئانی پيرۆز كە سەرچاوەی يەكەمی پەيامی پيرۆزی ئيسلامە , هيوادارم لە داهاتوودا لەگەڵ كەسانی تری خەمخۆری ئەم قورئانە بتوانين سەرجەم بەشەكانی (فی ظلال القرآن ) بگۆڕينە سەر زمانی كوردی كە بێگومان بە خوێندنەوەيان خوێنەری وريا چەندين مانای بەرزی قورئانيی لا روون و ئاشكرا ئەبێت و ئاشنای چەندين راستی و ئاراستەو بۆچوونە قورئانيەكان دەبێت كە هاندەر دەبن بۆ زياتر دەستگرتن بە پەيامە پيرۆزەكەی خوای پەروەردگارمانەوە .. داواكارم لە خوای بالأدەست لە كەموكورِيەكانم چاوپۆشی بكاو خوێنەری بەرِێزيش لە دوعای چاك بێبەشمان نەكات ..

هەولێر

كانوونی يەكەم ٢٠١٣

## پێشەکی

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ژیـان لـە ژێـر سـێبەری قورئانـدا بەهرەیـە ، بەهرەیەکـە ئـەوەی نـەی چێشتبێت نایزانێ ، بەهرەیەکە تەمەن بڵندو خاوێن و پیرۆز دەکاتەوە .

سوپاس بۆ خـوای گـەورە ... کـە وای بـۆ رەخـساندم ماوەیـەك لـە ژێـر سێبەری قورئاندا بژیم .. لەو ماوەیەدا ئەوەندەی من تام وچێژم لە نیعمەت و بـەهرەکانی خـوای پـەروەردگار وەرگـرت هـەرگیز لەژیانمـدا بـەو جـۆرە نـەم چێشتبوو . لەو ماوەیەدا گوێم لە خوای بالأدەست ئەبوو کە چۆن بەم قورئانـە لەگەڵمـدا ئـەدوا .. منـی بەندەیـەکی لاوازو بێدەسـەلأت .. ! ئـای ئـەوە چ رێزلێنان و بەها بەخشینێکە بەم مرۆڤـە ؟ چ پیرۆزیەکە بۆ تەمەن و بۆ ژیان ؟

لەژێر سێبەری قورئاندا ژیام و لە بڵندیەوە ئەم روانیە ئەو نەفامی و سـەرگەردانیەی مرۆڤـایەتی تێـی کـەوتوەو ئەمڕوانیـە ئـەو ئاسـتە ساوایەی هەیەتی لە گرنگیدان بە دیاردە بچوك و کـەم نرخـەکان .. ئەم بینـی کـە چۆن ئـەو خەڵکـە زۆر سەرسـام بـوون بـەو زانیاریـە کـەم و ئـەو بۆچـوونە ساکارومنالأنەیان و چـۆن خۆشـیان بـە شـتی منالأنـەوە خـەریك کـردوە .. هـەروەك چـۆن گەورەیـەك ئەڕوانێتـە گەمـە و هـەوڵ و ماندووبوونـە بـێ سـەروبەرەکانی منـدالأن .. باشـە ئـەبێ بـۆ وایـان بەسـەرهاتبێت ؟ بـۆ وا کەوتونەتە ئەو زەلکاوە رەشـەی ژیانـەوە ؟ ئەی بۆ گوێنـاگرن لـەو بانگـەوازە پیرۆزو بڵندەی خـوای پـەروەردگاریان ؟ ئەو بانگەوازەی تەمەن پیرۆزو بڵندو خاوێن دەکاتەوە ؟

هەر لە ژێر سێبەری قورئانـدا ژیام و بیرم لـەو بۆچونە گشتگیرو تـەواوو تێروتەسەلە ئەکردەوە کە هەیـەتی دەربارەی مەبەسـتی بـوونی بونـەوەران و هـەروەها مەبەسـتی بـوونی مـرۆڤیش .. لەهـەمان کاتـدا ئـەو بۆچـونە ساکارو نزمانـەم پـێ بـەراورد ئـەکرد کـە مرۆڤـایەتی تیایانـدا دەژی، لـە رۆژهـەلأت و

رۆژئـاواداو لـه بـاكورو باشوريـشدا .. پاشـان لـه خـۆم ئەپرسـی : باشـه ئـەم مرۆڤـایەتیه چۆن ئـەتوانێت لـەو زەلكـاوه خەستەدا بژی ؟ چۆن لـەو ئاستـه نزمو تاریکیه ئەنگوستەچاوەدا ئەژی ، كه له نزیكیەوه ئەو گۆڕەپانه فراوان و ئەو ئاسۆ تەخت و ئەو رۆشنایی و روناكیه بەربلاوەی هەبێت ؟

لـه ژێـر سـێبەری قورئانـدا ژیـام و هەسـت بـەو رێكـی و پێكەوەگونجانـه جوانه دەكەم كه له نێوان جولەی مرۆڤـ بەو شێوازەی خوای گـەوره دەیـەوێت و جولـەی ئـەم گەردونـەدا هەیـه كـه ئـەویش هـەر خـوای بالادەسـت خـۆی بەدیهێناوه .. دواتـر كـه سـەرنج ئـەدەم .. ئـەو سـەرگەردانیه بـەدی دەكـەم كـه مرۆڤایـەتی تێیكـەوتوەو دەنـاڵێنێ بەدەستیەوه هـەر لـه ئـەنجامی لادانیـان لـه یاساگەردونیەكان و نەگونجانی نێوان ئەو خراپـەكاری وشەڕویستیەی كـه بـه سەریاندا سەپێنراوەو نێوان ئەو سروشته پاك و فیترەیەی كه خوای مەزن تیا چاندوەو لـه دڵـی خۆمـدا ئـەڵێم : ئـەوه چ شـەیتانێكی بـەدكاری نەگریـسه وا پێشی كەوتوەو بەرەو هەڵدێری ناودۆزەخی دەبات ؟

داخ و مەخابن بۆ ئەم خەڵكه !!!

لـه ژێـر سـێبەری قورئانـدا ژیـام و بوونـەوەرم زۆر گـەورەتر ئـەبینی لـەو رواڵەتـەی كـه لـه بەرچـاومانه ..گـەورەتره لـه راسـتیەكانیدا ، گـەورەتره لـه فرەلایەنیدا .. بریتیه له هـەردوو ژیـانی دیارونادیـار نـەك بـه تـەنها جیهـانێكی نادیار .. ژیانی سـەرزەوی و ژیـانی رۆژی دوایيـشه ، نـەك هـەر ئەم دنیایـه بـه تەنیا .. دروستبوونی مرۆڤـیش درێژبۆتەوه بەناو پێچ و پـەناكانی ئـەم بـواره فراوانەداو .. مـردنیش كۆتـایی كـاروانی ژیـانی مرۆڤـ نیـه ، بـەڵكو قۆنـاغێكی كاروانەكەیه .. ئەوەی مرۆڤـ دەستی دەكەوێت لەسـەر زەوی هـەر ئـەوه هـەموو دەستكەوتەكانی نیه ، بەڵكو ئەوه تەنها بەشێكه له دەسـتكەوتەكانی ، ئـەوەی لـــەم ژیانەیـــدا دەســـتی ناكـــەوێت لـــه پاداشـــتەكانی ، لـــەوێ هـــەمووی وەردەگرێتەوه، چونكه لەوێ نەستەمكردن هەیه نه مافخوران نه بەكەمزانین .

ئەو قۆناغەی لەسەرئەم زەویە دەیبڕێ گەشتێکە بە گەردونێکی زیندووی دۆست و جیهانێکی هاوڕێ و دڵسۆزدا . ئەم گەردوونە بوونەوەرێکی خاوەن هەستە کە توانای وەرگرتن و وەڵامدانەوەی هەیەو  روودەکاتە هەمان پەروەردگاری بەدیهێنەر کە مرۆڤی ئیماندار بە ملکەچیەوە رووی تێدەکات : ( وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَنْ فِي السَّماواتِ وَالْأَرْضِ طَوْعاً وَكَرْهاً وَظِلالُهُمْ بِالْغُدُوِّ وَالْآصالِ )(سەرجەم ئەوانەی لە ئاسمانەکان و لەسەر زەویشن خۆشیان بێ و ترشیان بێ خۆیان و سێبەرەکانیشیان ، بەیانیان وئێواران سوژدە دەبەن بۆ خوای گەورە) .. (تُسَبِّحُ لَهُ السَّماواتُ السَّبْعُ وَالْأَرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ ، وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ..)( هەر حەوت ئاسمانەکان و زەوی و ئەوانەی تیایدان تەسبیحی خوادەکەن ، وە هەموو شتێکیش تەسبیحی سوپاسگوزاری ئەو دەکات ) ..  چ خۆشیەك و چ سینگ فراوانی و چ دۆستیەك و چ دڵنیاییەکە ئەم بۆچوونە سەرانسەری و راست و دروست و بەرفراوانە دەیرژێنێتە ناو دڵ و دەروونەوە ؟

هەر لە ژێر سێبەری قورئاندا ژیام و ئەمبینی بەهای مرۆڤ زۆر گەورەترە لەهەر ئاست و پلەیەکی تری کە لەوەو پێش یا لەمەودواش دەستی دەکەوێت .. ئەو بە فووەهەناسەیەکی پاکی خوای بالأدەست بوە بەم ئادەمیزادە : ( فَإِذا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي فَقَعُوا لَهُ ساجِدِينَ )( گەر دروستم کردو لە گیانی خۆم فوم پیاکرد ئەوا هەموو سوژدەی بۆبەن ).. هەربەو فووەهەناسەیەش کرا بە جێنشینی خوای پەروەردگار لە سەرزەوی : ( وَإِذْ قالَ رَبُّكَ لِلْمَلائِكَةِ : إِنِّي جاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً )( کاتێ کە خوای پەروەردگارت بە فریشتەکانی فەرموو : وا من لەسەر زەویدا جێنشینێکم دانا ) .. ئیتر بۆ ئەو مەبەستەش سەرجەم بونەوەرانی سەرزەویم بۆ ژێردەستەکردوەو ئەتوانێ بەکاریانبێنێت : ( وَسَخَّرَ لَكُمْ ما فِي السَّماواتِ وَما فِي الْأَرْضِ جَمِيعاً )( ئەوەی لە سەر زەویدا هەیە هەر هەمویم بۆ ژێردەستەکردوون ) .. وە لەبەر ئەم رێزلێنانە بێ وێنەو ئەم ئاستە بڵندە خوای گەورە وایکردوە تەنها

پەیوەندیەکی راست و بڵند کە ئەم مرۆڤایەتیەی لەسەر کۆببێتەوە ئەبێ ئەو پەیوەندیە بێت کە راستەوخۆ لەو هەناسە پاکە پیرۆزەوە سەری هەڵدابێت ، ئەویش پەیوەندی باوەڕبوونی پتەوی بێ گرێیە بە خوای گەورەو بالادەست .. چونکە هەر بیرو باوەڕوعەقیدەیە کە بۆ مرۆڤی موسوڵمان ئەبێت بە نیشتمانی و نەتەوەو خزم و کەسوکاریشی .. هەر بۆیە پێویستە مرۆڤایەتیش هەموو تەنها لە سەر ئەو بنچینەیە یەکگرن و کۆببنەوە ، نەك لەسەر ئەو بنەمایانە کۆببنەوە کە گیانلەبەران لەدەوری کۆ ئەبنەوە وەك : خواردن و لەوەڕو لەوەڕگاو مێگەل و شوراو سنوور ! ..

زانیم کە مرۆڤی موسوڵمان رەسەنەو رەچەڵەکێکی زۆر کۆنی هەیە و پشت و باوانی بە قولایی مێژوودا درێژبۆتەوە ، ئەو یەکێکە لەو کاروانە پیرۆزەی دەستەیەك لە پیاوان و سەروەرانی پایە بەرز سەروەری دەکەن : نوح و ئیبراهیم و ئیسماعیل و ، ئیسحاق و یەعقوب و یوسف و، موساو عیسا و موحەمەد .. درودو سەلامی خوایان لێبێت .. ﴿ وَإِنَّ هَـذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاتَّقُونِ ﴾( هەر ئا ئەمە بە تەنها نەتەوەکەتانەو منیش پەروەردگارتانم و جا ئیتر بمپەرستن و لێم بترسن ) ..

ئەم کاروانە پیرۆزە ، کە پشت و باوانی بە قولایی مێژوودا درێژبۆتەوە ـ هەروەك لەژێر سێبەری قورئاندا روندەبێتەوە ـ بە درێژایی مێژوو هەمان هەڵوێست و هەمان تەنگژەو هەمان ئەزمونیان دێتەڕێ ، با کات و شوێن و سەردەم و رۆژگارو نەتەوەکانیش بگۆڕێن و لەیەك نەچن .. هەر هەمویان بەرەنگاری گومرایی و سەرلێشێوان و ملهوڕی و ئارەزوپەرستی و ستەم و ئازاردان و هەڕەشەو دەربەدەری بونەتەوە .. بەلام مرۆڤی موسوڵمان بە هەنگاوێکی چەسپاوو ویژدانێکی ئاسودەو دڵنیا لە سەرکەوتنی خواییەوە بەردەوامەو چاوی لە بەخششی ئەوەو وایدادەنێ کە لەهەر ساتێکدا بەڵێنی خوای میهرەبان دێتەدی و سەرکەوتن بەدەست دێنن : ﴿ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا

لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُمْ مِنْ أَرْضِنا أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنا. فَأَوْحى إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ الظَّالِمِينَ ، وَلَنُسْكِنَنَّكُمُ الْأَرْضَ مِنْ بَعْدِهِمْ . ذلِكَ لِمَنْ خافَ مَقامِي وَخافَ وَعِيدِ ) (بێ باوەڕان بە پێغەمبەرەکانیان ئەوت : یا لە خاکی خۆمان دەرتاندەکەین یاخود ئەگەڕێنەوە نـاو کۆمـەڵگای ئێمـە ، خـوای پـەروەردگاریش هـەواڵی ئـەوەی دانـێ کـە ستەمکاران لـەناو دەبـەین و دواتـریش لـە خـاکو زەوی ئەوانـدا جێنـشینتان دەکەین ، ئەم پاداشتەش بۆ ئەوانەیە کە لە دەسەلآت و توانای مـن ئەترسـن و لە سزای سەختی رۆژی دواییش سڵئەکەنەوە ) .. هـەمان هەڵوێست و هـەمان ئـەزموون و هـەمان هەڕەشـە .. هـەمان دڵنیـایی و هـەمان بەڵێنیـشە بـۆ ئـە کاروانـە پـیر ۆزە .. هـەر هـەمان ئاکـامیش چـاوەڕێی موسـوڵمانان دەکـات لـە کۆتاییـدا ، کـاتێ کـە ئـەو چەوسـاندنەوەو هەڕەشـەو تۆقاندنـە ئێخـەیان پێدەگرێت ..

لـە ژێـر سـێبەری قورئانـدا ئـەوە فێربـوم کـە ئـەم بونـەوەرە نەشـوێنی رێکەوتی کوێرانەی تیایە نە شوێنی کارو روداوی کتوپرو چاوەروان نەکراو : ( إِنَّا كُـلَّ شَـيْءٍ خَلَقْنـاهُ بِقَـدَرٍ )( ئێمـە هـەموو شـتێکمان بـە ئەنـدازەی تـەواو بەدیهێناوە ).. ( وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيراً )( هـەموو شـتێکی بـەدیهێناوەو بـە ئەندازەیـەکی وردیـش دیـاری کـردوە ) ..هـەر کارێـك بـۆ مەسـتێکە ، بـەلآم مەبەستی قوڵی غەیبی نادیار وا زوو لە دیدی کورتی مرۆڤدا ئاشکرا نابێت : ( فَعَسـى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئاً وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْراً كَثِيراً ، وَعَسى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئاً وَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ، وَعَسى أَنْ تُحِبُّوا شَيْئاً وَهُوَ شَرٌّ لَكُمْ . وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لا تَعْلَمُونَ )(لەوانەیە رقتان لـە شـتێك ببێتـەوە بـەلآم خـوا خێرێکـی زۆری تیـا دانابێـت ، وە یـا رقتـان لـە شتێك ببێتەوە کەچی خێریشی تیایە بۆتـان . لەوانەشـە شـتێکتان بـە دڵ بـێ کەچی خراپەی تیایە بۆتان . هەر خوا خۆی ئەزانێ و ئێوە نایزانن ) ..

ئـەو هۆکارانـەی خـەڵکی ئـە یـزانن و ئاشـنای بـوون لەوانەیـە هـەمان کاریگـەریان بـە دوادا بێـت و لەوانەشـە وا نـەبێت ، ئـەو پێـشەکیانەش کـە

خــەڵكی وایــدادەنێن كــە حەتمیــەو دەبــێ وابێــت لەوانەیــە كاریگـــەرو ئەنجامــەكانیان وەك خۆیـان بەدوایانـدا نەیـەن . چـونكە مـەرج نیـە هۆكـارو پێــشەكیەكان هــەمووكات شــوێنكارو ئەنجامــەكانیان هاوشــێوەی خۆیــان دەربكـەون ، بـەڵكو تـەنها ویـستی رەهـای خـوای باڵادەسـتە كـە بەدیهێنـەری كاریگەرو ئەنجام و هۆكارو پێشەكیەكانیشە : ( لا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْراً )( تۆ چوزانیت لەوانەیە خواخۆی دواتر كارێكی تر بكات ).. ( وَما تَشاؤُنَ إِلَّا أَنْ يَشاءَ اللَّهُ )( كارەكانتان بە ئارەزوی ئێوە نابێت بە ڵكو ئەبێ خوا خۆی ویستی لەسەر بێت ).

موسوڵمان بۆیە دەست بۆ هۆكارەكان دەبات چونكە فەرمانی پێكراوە كە بـەكاریان بێنێـت لـە ژیانیـدا ، بـەڵام خـوای كاربـەجێ هـەر خـۆی دەرەنجـام وكاریگەریكانیش دیاری دەكات، ئیتر تـەنها دڵنیـایی بوون بە بەخشندەیی و دادپەروەری و دانایی و زانایی ئەوە تاكە پەنای ئارام و بێ ترس و بێ خـەم ، رزگاربونیــشە لــە دڵــەڕاوكێ و پــەرتبونی بیروهــۆش : ( الشَّيْطانُ يَعِدُكُمُ الْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُمْ بِالْفَحْشاءِ ، وَاللَّهُ يَعِدُكُمْ مَغْفِرَةً مِنْهُ وَفَضْلًا ، وَاللَّهُ واسِعٌ عَلِيمٌ )( شەیتان بەڵێنی هــەژاری و نــەداریتان پێــدەداو فــەرمانی ئەنجامــدانی داوێنپیــسی و خراپـەكاریتان پێـدەكات ، خـوای گـەورەش بـەڵێنی لێخۆشبون و بەخششی زۆرتان دەداتێ ، هەرخوا خۆی دەستبڵاوو بەخشندەو فرەزانایە )..

پاشـانیش هـەر لـە ژێـر سـێبەری قورئانـدا بـە دڵـودەرونێكی هـێمن وهەستونەسـتێكی ئـارام و بـە ویـژدانێكی ئاسـودە وە ژیـام .. وا ئـەژیام كـە دەسـتی توانـای خـوای پـەروەردگارم لـە هـەموو روداوو لـە هـەموو شـتێكدا ئەبینی ، لە پەنای خواو لە سایەی ئەودا ئەژیام ، هەستم بە سیفەتە بەرزو جـوان و كاراكـانی ئـەكرد .. زانـیم كـە ئـەم بوونـەوەرە بـێ خـاوەن نیـەو هـەروا نەدراوەتـە دەسـت چـەند یاسایەكی مـەیكانیكی كوێری كـەڕوالڵ ، بـەڵكو لـە پشت هەموو یاسا گەردونیەكانەوە ویست و دەسـەڵاتێكی باڵای ڕەها هەیـە ،

خوای بالادەستیش بە ویستی خۆی چی بوێت دەیکاو چی بەدیبهێنێت بەدیئەهێنێ و سنوور بۆ تواناو دەسەلآت و ویستی بالای ئەو پەروەردگارە نیە :( أَمَّنْ يُجِيبُ الْمُضْطَرَّ إِذا دَعاهُ وَيَكْشِفُ السُّوءَ؟ )( ئەی ئەبێ ئەوە کێ بێت کە بە هانای ئەو کەسەوە دەچێت کە لە تەنگانەدا پەنای بۆ دەبات و داوای یارمەتی لێدەکات یا زیان و ناخۆشیەکانیان لەسەر هەڵدەگرێت ؟ )..( وَهُوَ الْقاهِرُ فَوْقَ عِبادِهِ وَهُوَ الْحَكِيمُ الْخَبِيرُ )( هەر ئەوە زاڵ و دەستڕۆیشتوو بەسەر بەندەکانیەوەو هەر ئەویش داناو شارەزایە) ..( وَاللَّهُ غالِبٌ عَلى أَمْرِهِ وَلكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَعْلَمُونَ )( خوا هەر خۆی دەست بەسەر کارەکانیەوە دەگرێ و بە ئەنجامیان دەگەیەنێت ، بەلام زۆربەی خەڵکی ئەم شتە نازانن و ئاگایان لێی نیە ) .. (وَاعْلَمُوا أَنَّ اللهَ يَحُولُ بَيْنَ الْمَرْءِ وَقَلْبِهِ )( ئەوەش بزانن کە خوای گەورە بەربەستە لە نێوان مرۆڤو ویستەکانی دڵودەرونیدا ) .. ( فَعَّالٌ لِما يُرِيدُ ) (هەر ئەو کاراو چالاکە لە ئەنجامدانی ئەوەی دەیەوێت )..( وَمَنْ يَتَّقِ اللهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجاً وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لا يَحْتَسِبُ ، وَمَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَى اللهِ فَهُوَ حَسْبُهُ.إِنَّ اللهَ بالِغُ أَمْرِهِ )( وە هەر کەسێك لە خوا بترسێت ئەوا دەرگای خۆشی لێدەکاتەوەو بەبێ ئەوەی خۆی چاوەڕێی کردبێت پێی دەبەخشێت ، وە هەرکەسێکیش پشت بەخوا ببەستێت ئەوا با ترسی نەبێ و ئەو پاڵپشتی دەبێت . خوای گەورە دەستی بالای بەسەر کارەکانیدا دەڕوا )..( ما مِنْ دَابَّةٍ إِلَّا هُوَ آخِذٌ بِناصِيَتِها )( وە هیچ زیندەوەرێك نیە کە جڵەوی ژیانی بە دەست خوای گەورەوە نەبێت)..( أَلَيْسَ اللَّهُ بِكافٍ عَبْدَهُ وَيُخَوِّفُونَكَ بِالَّذِينَ مِنْ دُونِهِ )( ئەی خوای مەزن بەس نیە بۆ بەندەکانی وە دەتترسێنن بەو کەمدەسەلأتانەی لە خوار ئەوەوەن ).. ( وَمَنْ يُهِنِ اللَّهُ فَما لَهُ مِنْ مُكْرِمٍ )( وە هەر کە سێك خوا ریسوای کات ئیتر کەس ناتوانێت ڕێزداری بکاتەوە ) ..( وَمَنْ يُضْلِلِ اللَّهُ فَما لَهُ مِنْ هادٍ )( وە هەر کەسێکیش خوا گومڕای بکات کەس ناتوانێت بیخاتەوە سەر ڕاستەڕێ ) ...

ئەوەش فێربووم کە دەستی ویستی خوا کاردەکات .. بەڵام بە شێوەی تایبەتی خۆی کاردەکات ، ئیتر بۆمان نیە پەلەی لێبکەین ، یا پێشنیار بۆ خوا دابنێین . چونکە بەرنامەی خوایی ـ هەروەك لە ژێر سێبەری قورئاندا دەردەکەوێت ـ بۆ ئەوە داڕێژراوە کە لە هەموو ژینگەیەکدا کارابێت و دەستی پێوەبگیرێت ، لە هەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی گەشەی مرۆڤایەتی و لە هەموو بارێك لە بارە دەرونیەکانی ئادەمیزادا. ئەو بەرنامەیە بۆ ئەم مرۆڤە دانراوە کە لەسەر ئەم زەویەدا دەژی، ڕەچاوی سروشت و فیترەی ئەم مرۆڤەو وزەو تواناکانیشی کراوە ، ڕەچاوی ساتەکانی هێزداری وساتەکانی لاوازیشی کراوە، ڕەچاوی هەموو بارو دۆخە جیاجیاکانی کاروانی ژیانی کراوە ... هەرگیز بە چاوێکی نزمەوە سەیری ناکات و ڕۆڵی لەسەر ئەم زەویەدا بەکەم نازانێت و لە هەر شێوەیەك لە شێوەکانی ژیانیدا نرخ و بەهای بەفیڕۆنادات، جا ئەگەر بە تەنهابێت یاخود سەر بە کۆمەڵێك بێت ..هەروەها ئەو بەرنامەیە لە ئەندێشەدا نوقم نابێ و بێ ئاگا نابێت لەو مرۆڤەو زیاتر لە ئاستی خۆی سەیری ناکات و لە سەرو تواناو وزەی خۆشیەوە هیچی لێ داواناکرێت، یاخود پتر لەو ئەرکەی پێ ڕاناسپێردرێت کە خوای گەورە لە دروست بونیەوە بۆی دیاری کردوە .. ئیدی لە هەردوو بارەکەدا وا دانانرێ کە بنەماکانی سروشت و فیترەی سادەوساکاربن و بە یاسایەك بهێنرێنە کایەوەو بە نوکە قەڵەمێکیش بسڕێنەوە !.. مرۆڤ ئا ئەم بوونەوەرەیە بە سەرجەم سروشت و ئارەزوەکانیەوە . بەرنامەی خوا بەدەستەوە دەگرێت تا بەرەو بەرزترین پلەکانی دروستیی دەیبات کە بە پێی بەدیهێنانی وئەرکی سەرشانی بۆی دانراوە ، ڕێز لە خودو سروشت و بنەماکانی دەنێت و دەستی دەگرێت بەرەو ئەوپەڕی پلەکانی دروستیی کە بە خوای تاکوتەنهای دەگەیەنێت ..

هەروەها بەرنامەی خوا بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ دانراوە ـ ماوەیەك کە تەنها بەدیهێنەری مرۆڤو نێرەری ئەم قورئانە دەیزانێت ـ پاشان لە بە

ئەنجام گەیاندنی مەبەست وئامانجە بالآکانی ئەم بەرنامەیەدا بە پەلەو بێ ئارام نەبوە . بواری بەردەم فراوان ودوورە ، بە تەمەنی تاکە کەسێك کۆتایی نایەت و بە حەزو ئارەزوی مرۆڤێکی کەم تەمەن پەلەی لێناکرێت کە لەوە بترسێت مردن کۆتایی بە ئاواتە کورتەکانی بهێنێت ، هەروەك خاوەن بەرنامە مرۆییەکان دەیکەن، ئەوانەی کە دەیانەوێت کارەکانیان هەمووی لە تەنها نەوەیەکدا گیرخواردوو بکەن و بازدەدەن بەسەر فیترەو سروشتی هاوسەنگ وئارامدا، چونکە ئەوانە بەرچاو تەسکن و لەسەر هەنگاوی هێمن ودروست خۆیان پێ ڕاناگیرێ . ئیتر لەو ڕێگا کورتکراوەی دەیگرنەبەر پەلەدەکەن و خوێن دەڕژێ وسەرێکی زۆر لە لاشە جیادەکرێتەوەو، نرخ و بەهاکان پێشێل دەکرێن وکارەکان لە گرێژنە دەردەچن . لە کۆتاییشدا خۆیان دەڕوخێن و بیروباوەڕە دروستکراوەکانیشیان لە ژێرچەکوشی فیترەو سروشتی پاکی ئادەمیزاددا هەرەس دێنێت ! بەلآم بەرنامەی خوا کە ئاینی ئیسلامە هێدی هێدی لەگەڵ سروشت و فیترەی مرۆڤدا دەڕوات، لەلایەك هانی دەداو لە لایەکی تریشەوە ڕێگری لێدەکات ، کاتێکیش ویستی لە ڕێ لابدات راستی دەکاتەوە بە بێ ئەوەی تێکیبشکێنێ یاخود بیڕوخێنێت ، بەڵکو ئارامی لەسەردەگرێت، ئارامگرتنی شارەزایەکی دیدەڕۆشنی دڵنیا لە ئامانجە داڕێژراوەکانی خۆی .. ئەوەی لەم قۆناغەدا روونەدات با لە قۆناغی دووەم وسێیەم و یا دەیەمین و سەدەمین یاخود با لەقۆناغی هەزارەمیندا بێتەدی .. چونکە کات درێژو بەربلآوەو ، مەبەستەکان ئاشکراو روونن و ڕێگای بەرەو ئاوات بەرفراوان ودوورە ، هەروەك چۆن درەختێکی گەورە دەڕوێ و رەگەکانی بەخاکدا دەچێتەخوارێ و لقەکانی پەل دادەکوتێ و ئەچن بەناویەکدا . هەربەو شێوەیەش ئیسلام دەڕوێ و زۆر بەهێمنی هەنگاودەنێ ، بەئارامی و دڵنیایی ، ئاکامیش هەر ئەوەدەبێت کە خوای گەورە خۆی دەیەوێت ..

رووەکەکە لەوانەیە خۆڵ دایپۆشێت ، کرمیش بیخوات ، وەیا لە بێ ئاویدا وشك ببێت ، یا لە تێرئاویدا بخنکێت . بەڵام جوتیاری شارەزا دڵنیایە کە ئەوە رووەکێکە بەرگەدەگرێو گەشەدەکات و بەسەر هەموو ئەو زیان و بارە ناهەموارانەدا زاڵ دەبێت . ئیتر نە پەلەدەکاو نە دوودڵ دەبێت ، هەوڵی پێگەیاندنیان نادات بە کەرەستەکانی دوور لە سروشت وفیترەی هێمن وهاوسەنگ و بەسۆزو لێبوردە .. ئیتر ئائەوەیە بەرنامەو یاسای خوای بالآدەست لەسەرجەم بوونەوارانیدا .. ( وَلَنْ تَجِدَ لِسُنَّةِ اللّهِ تَبْدِيلًا )( وە هیچ گۆڕانکاریەك نابینی لە یاساکانی خوادا )..

هەق وراستی لەبەرنامەی خوادا لە دروستبوونی ئەم بوونەدا دێرین ورەسەنە . نەك لە ناکاوولە پڕ بووبێت، وەیا بە رێکەوت و بێ ئامانج بووبێت .. هەر خوای مەزن ــ سبحانە ــ هەق وراستە . وە هەر لە بوونی خوای گەورەوە هەموو بونەوەران بوونی خۆیان وەردەگرن : ( ذلِكَ بِأَنَّ اللّهَ هُوَ الْحَقُّ ، وَأَنَّ ما يَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ هُوَ الْباطِلُ ، وَأَنَّ اللّهَ هُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ )( ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە هەر خوا هەق و راستە ، ئەوانەش کە لێیان دەپاڕێنەوە جگە لەو هەموو ناهەق و نادروستن ، وە هەر خوا خۆی پایەبڵندو گەورەیە )..

خوای بالآدەست ئەم گەردوونەی بە هەق دروستکردوەو هیچ کارێکی بێ مەبەست نیەو هیچ ناهەقیەکیش تێکەڵ بە بەدیهێنراوەکانی ناکات : ( ما خَلَقَ اللّهُ ذلِكَ إِلَّا بِالْحَقِّ )( خوا ئەوانەی هەر بە هەق دروستکردوە )..( رَبَّنا ما خَلَقْتَ هذا باطِلًا سُبْحانَكَ )(خوای پەروەردگارمان ئەمانەت بە ناهەق دروست نەکردوە پاکی وبێگەردی هەر بۆتۆیە !). هەقیش بڕبڕەی پشتی ئەم بوونەیەو گەر لێی لابدات تێکدەچێ و دەڕمێ : ( وَلَوِ اتَّبَعَ الْحَقُّ أَهْواءَهُمْ لَفَسَدَتِ السَّماواتُ وَالْأَرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ )(خۆ گەر هەق دوای ئارەزووەکانی ئەوان بکەوتایە ئەوا ئاسمانەکان و زەویش و ئەوانەی تیایاندان سەرجەم دەشێوان ) . جائیتر هەردەبێ هەق و راستی سەرکەوێ و ، هەردەبێ ناهەق و ناڕەوا ژێرکەوێ ،

دیاردەکانیش هەر شێوەیەك بن دوور لەم راستیانە ئەوا چارەنوسیان ریسوا بوون و تێکشکانە : ( بَلْ نَقْذِفُ بِالْحَقِّ عَلَى الْباطِلِ فَيَدْمَغُهُ فَإِذا هُوَ زاهِقٌ )(بەڵکو هەق هەڵدەدەین بەسەر ناهەقداو دەیشارێتەوە ئیتر ئەویش دەپوکێتەوە) ..

چاکەخوازی چاکەکردن هەموویان وەك هەق و راستی رەسەنن و دەمێنن و لە ناوناچن ، هەروەك مانەوەو لەناونەچوونی هەق و راستیەکان : (أَنْزَلَ مِنَ السَّماءِ ماءً فَسالَتْ أَوْدِيَةٌ بِقَدَرِها ، فَاحْتَمَلَ السَّيْلُ زَبَداً رابِياً ، وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيْهِ فِي النَّارِ ابْتِغاءَ حِلْيَةٍ أَوْ مَتاعٍ ، زَبَدٌ مِثْلُهُ .كَذلِكَ يَضْرِبُ اللَّهُ الْحَقَّ وَالْباطِلَ . فَأَمَّا الزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفاءً وَأَمَّا ما يَنْفَعُ النَّاسَ فَيَمْكُثُ فِي الْأَرْضِ .كَذلِكَ يَضْرِبُ اللَّهُ الْأَمْثالَ ) ( لە ئاسمانەوە ئاوی ناردوێتە خوارێ کە لە دوڵەکانەوە بە ئەندازەی خۆیان لافاوی هەستاندوە ، لافاوەکەش کەفێکی زۆری هەڵگرتوە ، وە لەسەر ئەوخشڵ و زێرە تواوەی سەر کوورەی ئاگراکانیان هاوشێوەی ئەو کەفەی لەسەرە . ئابەوشێوەیە خوای گەورە هەق و ناهەق بە نموونە دەهێنێتەوە . جا کەفی سەرکەوتوو بە هەوادادەڕواو نامێنێ بەلأم ئەوەی سوود بەخشە بۆ خەڵکی لە سەر زەویدا دەمێنێتەوە . بەهەمان شێوە خوای مەزن نموونەکان دەهێنێتەوە ) .. ( أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُها ثابِتٌ وَفَرْعُها فِي السَّماءِ ، تُؤْتِي أُكُلَها كُلَّ حِينٍ بِإِذْنِ رَبِّها ، وَيَضْرِبُ اللَّهُ الْأَمْثالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ . وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ اجْتُثَّتْ مِنْ فَوْقِ الْأَرْضِ ما لَها مِنْ قَرارٍ. يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَياةِ الدُّنْيا وَفِي الْآخِرَةِ . وَيُضِلُّ اللَّهُ الظَّالِمِينَ وَيَفْعَلُ اللَّهُ ما يَشاءُ )( ئەی نابینی خوای گەورە چۆن نموونەیەك دەهێنێتەوە ئەویش وتەیەکی چاکە کە وەك درەختێکی چاك وایە ڕەگێکی چەسپاوی هەیە و لقەکانیشی بە ئاسماندا هەڵچوە ، هەموو کاتێکیش بە ویستی خوای خۆی بەروبووم دەدات ، خوای گەورە ئەو نموونانە بە مەبەستی بیرهێنانەوە بۆ خەڵکی دەهێنێتەوە . وە نموونەی وتەیەکی خراپیش وەك درەختێکی خراپ وایە کە بە ڕەگەوە لە خاك هەڵکەندرابێت و خۆی پێ راناگیرێت . خوای مەزن

ئەوانەی باوەڕیان هێناوە بە وتەی بەجێ و لەجێ دامەزراو دەکات لە ژیانی دونیاو لە دواڕۆژیشدا . وە خوای گەورە ستەمکارانیش گومڕادەکات و خوا خۆی چی بوێت ئەوەدەکات ) ..

ئەم بۆچوونە چ دڵنیاییەك دروست دەکات ؟ چ هێمنیەك دە بەخشێت بە دڵ ودەروون ؟ چ باوەڕبونێکە بە هەق و چاکەو چاکەویستی ؟ چ هێزو چ سەربەرزیەك بەویژدان دەبەخشێت بەسەر واقیعی بچووکیدا ؟

لە ماوەی - ژیانی ژێر سێبەری قورئاندا ـ گەیشتمە باوەڕێکی پتەوو بێ گرێ کە هیچ چارەیەك نیە بۆ ژیانی سەر ئەم زەویە و هیچ خۆشیەك نیە بۆ مرۆڤایەتی و هیچ دڵنیاییەك نیە بۆ ئەم ئادەمیزادە و ، هیچ بڵندی وپیرۆزی و پاکژی وگونجانێك لەگەڵ یاساکانی گەردوون و فیترەی ژیاندا نابینرێ .. بەبێ گەڕانەوە بۆلای خوای پەروەردگاری تاکو تەنها نەبێت ..

گەڕانەوەش بۆلای خوا ــ وەك لەژێر سێبەری قورئاندا دەردەکەوێت ــ تەنها یەك شێوازو یەك ڕێگای هەیە ، هەر ئەوەو هیچی تر ، ئەویش گەڕانەوەی ژیانە بەهەموو لایەنەکانیەوە بەرەو ئەو بەرنامەیەی خوای گەورە لە کتێبە پیرۆزەکەیدا دایرشتوە بۆ مرۆڤایەتی .. کە ئەبێ ڕووبکرێتە ئەو کتێبەو سەروەری بۆ ئەم کتێبە بێت لە ژیانی مرۆڤدا ، ئەگەرنا بەدکاری و خراپەکاریەکی بێ سنور سەرزەوی داگیردەکاو ژیان سەرتاپا ئەشڵەژێ و کارەکان لە گرێژنە دەرئەچن و گومڕایی و سەرگەردانی بە هەموولایەکدا بڵاو ئەبێتەوەو لە بری یەکخواپەرستی نەفامیی ئارەزووپەرستی جێی ئەگرێتەوە : ( فَإِنْ لَمْ يَسْتَجِيبُوا لَكَ فَاعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَاءَهُمْ . وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدىً مِنَ اللَّهِ ؟ إِنَّ اللَّهَ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ )( خۆ ئەگەر بەدەم باگەوازەکەتەوە نەهاتن ئەوە بزانە کە ئەوان دوای ئارەزوەکانی خۆیان ئەکەون . جا ئیتر کێ بێت سەرلێشێواوتر لەوانەی کە بەبێ ڕێنمایی خوای گەورە دوای

ئارەزووەکانی خۆیان کەوتوون ؟ خوای گەورە هەرگیز ڕێنمایی خەڵکێکی ستەمکار ناکات )

فەرمانکردن بە بەرنامەویاسای خوای گەورەو بالأدەست کە لە پەرتوکەکەیدا دیاری کردوە شتێك نیە لە سەر خواست و ئارەزوو یا بە هەڵبژاردن بێت ، بەڵکو ئەوە خۆی کرۆك و بنچینەی ئیمان و باوەڕە .. گەر نا .. بێ ئیمانی و بێ باوەڕیە : ( وَما كانَ لِمُؤْمِنٍ وَلا مُؤْمِنَةٍ إِذا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْراً أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ )( هیچ موسوڵمانێك نە پیاو نە ژن بۆی نیە کاتێ خوای مەزن کارێکی بڕیاردا کە بە ئارەزووی خۆیان بکەن بیانەوێ یا نەیانەوێت) .. (ثُمَّ جَعَلْناكَ عَلى شَرِيعَةٍ مِنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْها وَلا تَتَّبِعْ أَهْواءَ الَّذِينَ لا يَعْلَمُونَ . إِنَّهُمْ لَنْ يُغْنُوا عَنْكَ مِنَ اللَّهِ شَيْئاً ، وَإِنَّ الظَّالِمِينَ بَعْضُهُمْ أَوْلِياءُ بَعْضٍ ، وَاللَّهُ وَلِيُّ الْمُتَّقِينَ) دواتر تۆمان خستە سەر بەرنامەو یاسای کارەکەت ئیتر تۆش پەیڕەوی بکەو دوای ئارەزووەکانی کەسانی نەفام ونەزان مەکەوە . چونکە ئەوان لای خوا هیچ بەکەڵکت نایەن ، وە ستەمکاران پشتی یەکتری دەگرن و خوای بالأ دەستیش لایەنگری کەسانی لە خواترسە) ..

کەواتە کارەکە زۆر گرنگە .. چونکە هەر لە بنچینەوە کێشەی عەقیدەو باوەڕە ، کێشەی بەختەوەری و کامەرانی ئەم مرۆڤایەتیەیە . یا نەگبەتی و کلۆڵیەتی .. ئەم مرۆڤایەتیە ــ کە دروستکراوی خوای مەزنە ــ دەرگاکانی سروشت و فیترەی تەنها بە کلیلێك دەکرێنەوە کە دروستکراوی خوای بالأ دەست بێت ، نەخۆشی و نادروستیەکانی بەو دەرمانانە نەبێت کە دروستکراوی خوای گەورەن چارەسەر ناکرێت ، خوای گەورە ــ سبحانە ــ وایکردوە تەنها هەر لە بەرنامەو یاساکانی ئەودا کلیلی هەموو دەروازە داخراوەکان هەبێت و، چارەسەری هەموو دەردەکانیش هەر لای ئەو بێت : ( وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ ما هُوَ شِفاءٌ وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ )(ئەوەندە لە قورئان دادەبەزێنین کە چارەسەرو رەحمەت بێت بۆ باوەڕداران ) .. ( إن هذا القران يهدى للتى هى أقوم

)( ئەم قورئانە رێنمایی بەرەو کارە راست و دروستەکان دەکات) .. بەڵام ئەم مرۆڤایەتیە نایەوێ ـ بۆ کردنەوەیان ـ ئەو قوفڵە داخراوانە بباتە لای ئەو وەستایەی دروستی کردوون ، یا نەخۆشەکە ـ بۆ چارەسەرکردنی ـ بباتەوە لای بەدیهێنەرەکەی ، نایەوێت لە ئیشوکاری خۆی و کاروباری مرۆڤایەتی و هۆکانی بەختەوەری یاخود سەرگەردانیەکانی خۆیدا بگەڕێتەوە لای پسپۆڕی شارەزاو تایبەتمەند ، هەروەك راهاتووەو وا رەفتاردەکات لەمەڕ ئامێرو دەزگا بێ بەهاکانی خۆیدا کە بۆ پێویستیە ئاساییەکانی رۆژانەی خۆی بەکاریان دەهێنێت ( کە تێکدەچن ـ بۆ چاکردنەوەیان ـ دەیانباتە لای وەستای کارامەو شارەزا ).. دەشزانێ کە بۆچاکردنەوەیان پێویستی بە ئەندازیارانی ئەو کارگانەیە کە دروستی کردون . کەچی دوای هەمان یاسا ناکەوێ و هەمان رەفتارناکات دەربارەی خودی خۆی و ، نایباتەوە ئەو کارگەیەی لێوەی دەرچووەو ، راوێژ بەو بەدیهێنەرە ناکات کە ئەو ئامێرە بێ وێنەیەی دروستکردوە ، ئامێری مرۆڤی گرانبەهای وردی نەرم ونیان ، کە بە دیهێنەرو دروستکەری نەبێت کەس پەی بە بنج وبناوان و نهێنیەکانی نابات : ( إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذاتِ الصُّدُورِ . أَلا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ ؟ )( هەر ئەو زانایە بەوەی لە ناو سینەدا هەیە . بەڵێ ئەو ئەزانێت چی دروستکردوەو هەر خۆشی وردکارو شارەزایە ) ..

هەر ئالێرەوە نەگبەتی هات و یەخەی ئادەمیزادی سەرلێشێواوی گرت . ئادەمیزادی بەستەزمان و داماو، ئەو ئادەمیزاەی نەژیری و نە خۆشگوزەرانی و نە بەختەوەری بەخۆیەوە دەبینێت تا فیترەو سروشتی پاکی مرۆڤایەتی خۆی نە گەڕێنێتەوە ئامێزی بەدیهێنەرە بە دەسەڵات و مەزنەکەی خۆی ، وەك چۆن ئامێرێکی سادەی کەم بەهای ماڵی خۆی دەباتەوە لای وەستا یا ئەوکارگەیەی دروستیکردوە !

هەر بۆیە لادانی بەرنامەی ئیسلام لە سەروەریکردنی کاروانی ژیانی مرۆڤــایەتی روداوێکــی پشتــشکێن و نەهامەتیــەکی ئێجگــار گــەورەبوو کــە ئادەمیزاد توشی هاتبێت بە درێژایی تەمەنی ، هەرەسێك بوو وێنەی نەبوو لـە نێو ئەو هەموو ناهەمواریانەی کە بەسەر ئادەمیزاددا هاتبوون ..

لـە کاتێکدا کە ئیسلام جڵەوی سـەرکردایەتی گرتەدەست سـەرزەوی تێکـڕا ئەینالآنـد بەدەسـت گەنـدەڵی و خراپەکاریــەوە ، سـەرکردە بـودەڵ و گەنـدەکان سـەریان لـە خـەڵکی شـێواندبوو ، مرۆڤایـەتیان تووشـی چـەندەها ئەشـکەنجەو ناهـەمواری کردبـوو ، لـە هـەموو لایەکـەوە ئـاگری دووبـەرەکی و جەنگ و شەڕوشۆڕ هەڵدەستا: ( ظَهَرَ الْفَسادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ بِما كَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ ) (بەدکاری لە سەرزەوی و لـە نـاو دەریاکانیـشدا سـەری هەڵداوە لـە ئـەنجامی کاروکردەوەکانی خەڵکی) ..

ئـاینی ئیـسلام بـەم قورئانـە پیرۆزو بـەرزە و بـەو بۆچـوونە نوێیـەی کە قورئـان هێنایـە ئـاراوە ، بـەو یاسـاو شـەریعەتەی کە لـەم بۆچـوونە نوێیـەوە سەرچاوەی گرتبوو سەرکردایەتی گرتە دەست . بۆیە ئەمە بۆ ئادەمیزاد بوە لەدایکبونێکی نوێ کە لە راستیدا زۆر لە لەدایکبونەکەی یەکەمجاری مـەزنترو گـەورەتر بـوو .. ئـەم قورئانـە بۆچـونێکی نـوێی دامەزرانـد بـۆ ژیـان وبـەهاو یاساکان . کە پێش ئەوەی ئەم قورئانە بۆی باسبکات بە مێشکیدا نـەدەهات و بیریشی لێنەکردبووەوە . بەڵێ ئەم واقیعە ئەوەندە خاوێن وجوان و، گەورەو بڵنـدو، سـاکارو ئاسـان و واقیعـی و دوور لـە ئەندێشەو ، هاوسـەنگ وگونجـاو بوو کە هـەرگیز ئـادەمیزاد بـەو شێوازە ناوازەیـە بـە بیریـدا نایـەت گـەر خـوای مەزن بۆی دانەڕشتایە و، لە ژێر سێبەری قورئـان و بەرنامـەی قورئـان ویاسـاو شەریعەتی قورئاندا بۆی ئەنجام نەدابایە ...

بــەڵام ئــەوە بــوو ئــەو هەرەســهێنانە پشتــشکێنە رویــداو ئیــسلام لــە ســەرکردایەتی دورخرایــەوەو بەرنامــەو یاســاکانی ئارەزوپەرسـتی و نـەفامی

جارێکی ترو بە شێوەیەك لە شێوە زۆرەکانی ، کە شێوەی بیرو بۆچوونی ساکارو ئاست نزمی ماددیەتە ، سەرکردایەتی گرتەدەست .. شێوازی بیرکردنەوەی ماددی کە لەم سەردەمەدا ئادەمیزاد شانازی پێوەدەکاو خۆی پێ بادەدات ، هەر وەك چۆن منالآن خۆیان هەڵئەکێشن و خۆیان بائەدەن بەجلوبەرگێکی ئاڵ و والآ یا کاتێ بە بووکەڵەیەکی رەنگاورەنگەوە یاری دەکەن !

دەستەیەك هەن لە چەواشەکاران و خەڵەتێنەران و فێڵزانی دوژمنانی مرۆڤایەتی ، بەرنامەو ئاینی خوای گەورەی بۆ ئەخەنە تای تەرازوویەك و بەدەستهێنان و پێشکەوتنە مرۆییەکانی جیهانی ماددی بۆ ئەخەنە تاکەی تری تەرازووەکەوە ، ئینجا پێی ئەڵێن : هەڵبژێرە !!! یا بەرنامەی خوا بۆ ژیانی خۆت هەڵبژێرەو ئیتر ئەبێ پشت بکەیتە هەموو ئەو دەستکەوت و بەرهەمانەی لە جیهانی ماددیاتا مرۆڤ بەدەستی هێناون ، یاخود بەرهەم و دەستکەوتەکانی جیهانی زانیاری و تەکنەلۆجیا هەڵبژێرەو نابێ چیتر روبکەیتە بەرنامەو شەریعەتی خوا !!! کە ئەمەش فریودان و هەڵخەڵەتاندنێکی نەگریس و شەیتانانەیە ، چونکە کێشەکە هەرگیز بەو شێوەیە نیە .. بێگومان بەرنامەی خوا هەرگیز دوژمنی دەستکەوتەکان و بەدیهێنانی مرۆڤایەتی نیە ، بەڵکو ئەو خۆی سەرچاوەی ئەو بەدیهێنانەیەو خۆی ئاراستەی لەباروگونجاوی بۆ دائەنێت و هانی ئەدات ، بۆ ئەوەی مرۆڤ بە باشترین شێوە ئەرکی جێنشینی لەم سەرزەویەدا بە جێ بگەیەنێت .. ئەو پلەو پایەیەی کە خوای گەورە پێی بەخشیوەو ، توانای بەسەردا شکاندوەو ئەوەندە وزەی شاراوەی داوەتێ کە لە ئاستی ئەو ئەرك و راسپاردە پیرۆزەدا بێت و، ئەوەندە یاسا گەردونیەکانی بۆ ژێربارو رەخساندوە کە یاریدەری بن بۆ بە ئەنجام گەیاندنی ئەو ئەرکە مەزنە ، پێکهاتەی مرۆڤ و پێکهاتەی گەردوونیشی وا گونجاندوە لەگەڵ یەکتردا کە ژیان و کارو بەدیهێنان لە

بارترو ئاسانتربێت . بە شێوازێك كە خودی ئەو كارو بەدیهێنانە ببێتە شێوەیەك لە خواپەرستی و هۆكارێك بێت بۆ ڕەزامەندی خوای بالأدەست .

بەلأم ئەوانەی بەرنامەی خوا دەخەنە تایەكی تەرازوەكەوەو ، دەستكەوتەكانی مرۆڤیش لە بواری ماددیدا لە بەرامبەریدا دادەنێن ، ئەوانە نیازخراپن و ، شەڕە نكێزن و، بە دوای ئادەمیزادی ماندووی سەرگەردانەوەن و هەر كاتێ شەكەت وماندوو بوو بێت بەهۆی گومڕایی و سەرگەردانی و سەرلێشێواویەوە ، یا گەر ویستبێتی گوێ هەڵخات بۆ ئامۆژگارێكی دڵسۆز ، یا بگەڕێتەوەو بەئاگابێتەوە لەو سەرگەردانیە ناهەموارەو ، لە پەنای خوای گەورەدا تاوێك ئارام و دڵنیا بێتەوە .. ئا لەو كاتو ساتانەدا ڕاوی دەنێن ونایەڵن تەنها پشوویەكیش بدات .

هەندێكی تریش هەن نیازیان خراپ نیە ، بەلأم تێگەیشتنێكی بەرفراوانیان نیە و كاڵفامن و بیرو هۆشیشیان سادەیەو قووڵ نیە .. ئەوانە پێشكەوتنی مرۆڤ لە بواری یاسا سروشتیەكاندا هەڵیخەڵەتاندوون و مەستی كردوون ، سەركەوتنەكانی مرۆڤیش لە جیهانی مادیگەریدا سەرسامی كردوون . بۆیە ئەم مەستی و ئەم سەرسامیە لە هەستیاندا جیاوازی دەخاتە نێوان هێزە سروشتی وئیمانیەكان و نێوان كارو كاریگەریەكانی لە واقیعی ژیاندا ، بواری یاسا سروشتیەكان جیادەكەنەوە لە بواری بەها ئیمانیەكان . وادەزانن كە یاسا سروشتیەكان لە ڕەوتی خۆیاندا بەها ئیمانیەكان كاریان تێناكات و ئەنجامەكانی خۆیان دەگەیەنن گەر خەڵكی باوەڕداربن یا خود بێ باوەڕو كافرین ، هەڵگری بەرنامەی خوای مەزن بن یاخود پشتیان تێكردبێت ، فەرمان بە یاساو شەریعەتی خوای گەورە بكەن یاخود ویست و ئارەزووەكانی مرۆڤ كارەكانیان بەڕێوەببات !

ئەمە بەهەڵەداچونەو پێچەوانەی ڕاستیەكانە.. ئەمە جیاكردنەوەیەكی ناڕەوای دوو جۆر لە یاساكانی خوایە كە لە كرۆكیاندا یەكن و جودانین ،

چونکە ئەم بەها ئیمانیانە بەشێکن لە یاساکانی خوای گەورە لە گەردووندا و هاوتــان لەگــەڵ یاســا سروشــتیەکان و ئەنجامەکانیــشیان پەیوەســت و تێهەڵکێشن ، هەر بۆیە لە هەست و بۆچوونی مرۆڤی موسوڵماندا یەك بابەتن وهیچ پاساوێکیش نیە بۆ جیاکردنەوەیان .. ئەمەش ئەو بۆچونە دروستەیە کە قورئان لە دەروندا دروستی دەکات کاتێ لە ژێر سێبەری قورئادا دەژی .

لەو کاتانەشدا دروستی دەکات کە باسی خاوەن پەرتوکە ئاسمانیەکانی پێشوو دەکات و باسی لاری و لادانیان دەکات و کاریگەری ئەو لادانەش لەسەر ئاکامی ڕێبازی ژیانیان : ( وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْكِتابِ آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَكَفَّرْنا عَنْهُمْ سَيِّئاتِهِمْ وَلَأَدْخَلْناهُمْ جَنَّاتِ النَّعِيمِ . وَلَوْ أَنَّهُمْ أَقامُوا التَّوْراةَ وَالْإِنْجِيلَ وَما أُنْزِلَ إِلَيْهِمْ مِنْ رَبِّهِمْ لَأَكَلُوا مِنْ فَوْقِهِمْ وَمِنْ تَحْتِ أَرْجُلِهِم )(خۆ ئەگەر خاوەن پەرتوکەکان باوەڕیان بهێنایە و خۆیان بپارێزایە ئەوا لە گوناهەکانیان خۆش دەبوین و دەمان خستنە بەهەشتی پڕ نازونیعمەتەوە . خۆ گەر فەرمانیان بە یاساکانی تەورات و ئینجیل و ئەوەی لە خوای گەورەوە بۆیان هاتبوە خوارەوە بکردایە ئەوا لە سەروو خۆیانەوەو لە ژێر پێشیاندا بەروبومیان دەخوارد).. هەروەها هەمان بۆچوونیش دروست دەکات کاتێ باس لە بەڵێنی نووح ــ سەلامی خوای لێبێت ـ دەکات بۆ گەلەکەی : ( فَقُلْتُ : إسْتَغفِرُوا رَبَّكُمْ إنَّهُ كانَ غَفَّاراً يُرْسِلِ السَّماءَ عَلَيْكُمْ مِدْراراً ، وَيُمْدِدْكُمْ بِأَمْوالٍ وَبَنِينَ ، وَيَجْعَلْ لَكُمْ جَنَّاتٍ وَيَجْعَلْ لَكُمْ أَنْهاراً )( منیش پێم وتن : داوای لێخۆشبوون لەخوا بکەن چونکە ئەو لێبووردەیە و، لە ئاسمانەوە بە خوڕ بارانتان بۆ دەنێرێتە خوارەوە و، پارەو ماڵ منداڵیشتان پێدەبەخشێت و، باخوباخات و ڕووباریشتان بۆ پەیدا دەکات ).. وە کاتێکی تریش دروستی دەکات کە واقیعی ناوەو دەرونی مرۆڤ دەبەستێت بە واقیعی ئەو دەوروبەرەی کە تیایدا دەژی : ( إِنَّ اللَّهَ لا يُغَيِّرُ ما بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا ما بِأَنْفُسِهِمْ )( خوای مەزن بارو گوزەرانی هیچ خەڵکێك ناگۆڕێت تا خۆیان خودی خۆیان نەگۆڕن )..

باوەڕهێنـان بە خـواو ، بە راسـتی و بە دروسـتیی پەرسـتنی ئەو خوایـەو پیادەکردنی فەرمانڕەوایی یاساو شەریعەتی خوا لە سەر زەویـدا .. سەرجەم ئەنجامـدانی یاسـاکانی خـوای بالأدەسـتە ، کە هـەر هەموویان یاسـای بڵنـدو دانـسقەو چـالاکن . هـەر لـە هـەمان هێـزەوە سەرچـاوەدەگرن کـە یاسـا گەردونیەکانی تری لێوە پەیدا بوەو شوێنکارە واقیعیـەکانیان بە هەست و بە تاقیکردنەوەش دەبینرێن .

هەندێ جار رواڵەتی چەند دیمـەنێك لـە جیابونـەوەی یاسا گەردونیـەکان رامـان دەکێـشێت بـەلای خۆیانـدا ، کـاتێ کـە دەبیـنین شـوێنکەوتنی یاسـا سروشـتیەکان ئـەنجامیان سـەرکەوتن دەبێـت لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە لادان و دوورکەوتنـەوەی تیایـە لـە بەها ئیمانیـەکان .. ئەم جیابونەوەیـە لەوانەیـە لـە سەرەتای رێگـادا بەرئەنجامـەکانیان دەرنەکـەون ، بەڵام بێگومـان لـە کۆتاییـدا هەردەدەکـەوێت .. هـەر ئەمـەش بـوو لـە کۆمـەڵگای ئیسلامیدا روویـدا، هێڵـی بەرزبوونــەوەی ئــەو کۆمەڵگایــە لــە خــاڵی بــە یــەك گەیــشتنەوەی یاســا سروشتیەکان لە ژیاندا لەگەڵ بە ها ئیمانیەکاندا دەستی پێکردوە ، وە هێڵـی نزمبوونەوەشـی بێگومـان لـە خـاڵی جیابونەوەیانـدا دەسـتی پێکـرد .. ئـیتر هەروا نزم دەبوەوەو رۆدەچوو هەر کە گۆشەی جیابونـەوەیان گـەورەتردەبوو. تاوای لێهات گەیشتە نـزمترین پلـەی کاتێ کـە هـەردوو یاسا سروشـتیەکان و بەها ئیمانیەکانی لاوەناو پشت گوێی خستن و رووی لێوەرچەرخاندن ..

لەوبەریشەوە شارستانیەتی ئەمڕۆی ماددیگەری لە بەرامبـەردا راوەسـتاوە . راوەستاوە وەك باڵندەیەك کە تـەنها بە یـەك بـاڵی زەبەلاحـەوە باڵەفڕئەکات ، کەچی باڵەکە تری شکست و شکاوە . ئیتر هەروا لە پێشکەوتنە ماددیەکانـدا بەرزئەبێتـەوەو هـەنگاودەنێ بـەو ئەندازەیـەی کـە لـە مانـاو بـەها مرۆییەکانـدا رۆدەچـێ . ئەوەنـدە بەدەسـت دڵـەڕاوکێ و دوودڵـی و نەخۆشـیە دەرونـی و دەماریەکانـەوە دەنـاڵێنن کـە پیـاوە ژیـرو داناکانیـان هاواریانـەوەو بێهـوودە

بێداریان دەکەنەوە ، گەرچی راستە ڕێی بەرنامەی خوای گەورەیان لیٚ نزیکەو بۆی ناگەڕێن و نایدۆزنەوە ، کە بە تەنها هەر ئەوە تاکە ڕێگەو تاکە چارەو سارێژکەری سەرجەم ئەو دەردانەیانە ..

یاساو شەریعەتی خوا بۆ خەڵکی چمکێکە لە یاسا گشتیەکەی خوا بۆ سەرجەم ئەم گەردوونە ، وە پیادەکردنی ئەم یاساو شەریعەتە هەرئەبیٚ کاریگەریەکی باشی هەبێت بۆ سەر گونجاندنی رەوتی خەڵکی و رەوتی گەردوون .. وە لەبەر ئەوەی شەریعەتیش بەرهەمی بیروباوەڕو ئیمانە بۆیە بەبیٚ ئەو بنچینەو بناغە گەورەیەی ناکەوێتە سەرپیٚ ، ئەو بۆ ئەوە دانراوە کە لە نێو کۆمەڵگایەکی موسوڵماندا کاربکات ، هەروەها بەشداریش بکات لە بنیاتنانی کۆمەڵگای موسوڵمان ، کە تەواوکەری بۆچوونەکانی ئیسلامە بۆ هەریەك لە بوونەوەری گەورەو بوونی مرۆڤایەتیش ، هاوشان لەگەڵ ئەوەی ئەم بۆچوونە دروستی دەکات لە ترسی خوا لە ویژداناو، خاوێنی لە هەست و نەستدا و ، گەورەیی و بەهاداری ئامانجەکان و ، بڵندی وجوامێری لە ئاکارو خووڕەوشتدا .. بەو پێیە گونجان و تەواوکاریەکی جوان و رەسەن دەرئەکەوێت لە یاساکانی خوای گەورەدا ، چ ئەوانەی پێیان ئەڵێین یاسا سروشتیەکان یاخود ئەوانەی پێیان ئەڵێین بەها ئیمانیەکان .. کە هەر هەموویان چمکانێکن لە یاسا گشتیەکەی خوای بالآدەست بۆ ئەم بوونەوەرە بەرفراوانە ..

هەروەها مرۆڤ هێزێکە لە هێزەکانی بوونەوەر. وە کردەوەو ویست و ، ئیمان و چاکەخوازی و، پەرستن و چالاکیەکانی هەموویان چەند هێزێکن کە کاریگەری دروستی خۆیان هەیە لەم بوونەدا ، هەمووشیان بەندن بە یاسا گشتیەکەی خوای بالآدەست بۆ ئەم بوونەوەرە بە گشتی . هەر هەمووشیان شان بەشانی یەکدی و بەوپەڕی گونجانەوە کاردەکەن ، بەرهەمەکانیشیان زۆر بەتەواوی دەبەخشن کاتیٚ کۆ دەبن و بەیەکەوە دەگونجێن ، بەلآم گەر

جیابوونەوەو دژ بەیەك كاریانكرد ، ئەوا كاردانەوەشیان تێكدەچێ و نابەجێ دەبێت ، ژیانیش لەگەڵیاندا بۆگەن دەبێ و سەرگەردانی وناهەمواری لە نێو خەڵكیدا بلاْودەبێتەوە : ﴿ ذلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّراً نِعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَى قَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا ما بِأَنْفُسِهِمْ ﴾( بێگومان خوای گەورە هیچ كاتێك نازو نیعمەتێكی بەخشی بێت بە خەڵكانێك لێی نەگۆڕیون تا خۆیان گۆڕانیان بەسەرخودی خۆیاندا نەهێنابێت ) .. كەواتە پەیوەندیەكی زۆر توندو پتەو هەیە لە نێوان كاروپیشەو هەستی مرۆڤ و نێوان ئەو رووداوانەی روودەدەن لە چواچێوەی یاسا سەرانسەری و گشتیەكانی خوای گەورەدا ، كە بۆ هەمووانە ، ئیتر هیچ كەسێك نیە هەوڵی هەڵوەشاندنەوەی ئەم پەیوەندیە بدات یا بانگەشە بكات بۆ تێكچوونی ئەم رێكوپێكی و گونجانە یا ببێتە بەربەست و رێگر لە نێوان خەڵكی و نێوان یاسا هەمیشەییەكانی خوای گەورەدا ، مەگەر كەسانێك نەبێ كە دوژمنی ئادەمیزادن و راویان دەنێن و دووریان دەخەنەوە لەو راستە رێیەی گرتویەتە بەر بەرەو خوای گەورەی خۆی ، بۆیە ئەبێ مرۆڤیش راویان بنێ و دووریان خاتەوە تا رێگا ئاوەڵابێ بۆ گەیشتن بەوخوا تاكوتەنهاو پەروەردگارە بەخشندەیە ..

ئەوانە چەند سەرنج و تێبینیەك بوون لە ماوەی ژیانی ژێر سێبەری قورئاندا ، ئاواتەخوازم خوای گەورە بیكاتە مایەی سوودو رێنمایی .. وما تشاءون إلا أن يشاء الله .. ( هیچ كارێكیش بە ویستی ئێوە نابێت مەگەر خوای گەورە خۆی ویست وئارەزوی لەسەر بێت) ..

* * *

## سوره‌تی فاتیحه (الفاتحة)

## مه‌ككیه ـ حه‌وت ئایه‌ته

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ۝١ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ۝٢ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ۝٣ مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ ۝٤ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ۝٥ اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ ۝٦ صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ ۝٧﴾

الفاتحة: ١ ـ ٧

مرۆڤــی موسـوڵمان لەهـەموو شـەو و ڕۆژێکـدا ئـەم سـوورەتە کورتـە حـەوت ئایەتیە بەلایەنی کەمەوە حەڤـدە جار ئەڵێتەوە . دوو ئەوەنـدەش زیـاتر گـەر نوێـژە سوننەتەکان بکـات ، یـاخود بـەبێ سـنوور دەیڵێتـەوە گـەر بیـەوێ پـتر لەبـەردەم خـوای خۆیـدا بوەسـتێ و بپاڕێتـەوە، ئـەوەش ئاشـکرایە کـە هـەر نوێـژێك ئـەم سـوورەتەی تیـا نـەخوێنرێ ناتـەواوە و وەرنـاگیرێ ، چـونکە پێغەمبـەر (ﷺ) دەفـەرموێ : (( لاصـلاة لمـن لم یقـرا بفاتحـة الکتـاب )) هەرکەسێ (فاتحە الکتاب) نەخوێنێ نوێژەکەی پووچەڵە.

هـەر لـەم سـورەتەدا ئەوەنـدە باسـی لایەنـەکانی عەقیـدە و بۆچـوونی ئیسلامی و هەست و نەست و ئاراستەکان کراوە ، ئەوە ڕوون دەکاتـەوە کە بۆچی خوای گەورە ئەم سورەتەی هەڵبژاردووە لەنێوان هەموو سورەتەکانی قورئاندا تا لەهەموو ڕکاتێکدا بخوێنرێت. ئەوەش ڕوون دەبێتـەوە کە بۆچی ئەو نوێژە بێبەهایەو وەرناگیرێ گەر ئەم سوورەتەی تیا نەخوێنرێ .

سوورەتەکە بە ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ دەست پێدەکات .. زانایان لەسەر ئەوە ڕێکنەکەوتوون کە ئایا ئەم (بەسمەلەیە) ئایەتێکی سەربەخۆیە یاخود ئایەتێکە لە قورئان سورەتەکانی پێ دەست پێدەکرێت لەکاتی خوێندنیاندا. بـەڵام ڕوونـتر وایـە ئایـەتێك بێـت لـە سـوورەتی فاتیحـە و هـەر بەویـشەوە ئایەتـەکانی دەبنـە حـەوت ئایـەت.. بـەڕای هەنـدێکی تـریش ئایـەتی (( ولقـد اتیناك سبعا من المثاني و القران العظـیم )) لەسورەتی (فاتحە)، مەبەستی سـورەتی فاتیحەیـە چـونکە حـەوت ئایەتـە و (دووبـارەش) دەکرێتـەوە لەهـەر نوێژێکدا .

دەست پێکردن بەناوی خوای گەورە ئەو ئەدەبەیە کە خوای مەزن لەیەکەم سـاتی هاتنـەخوارەوەی قورئانـدا فێـری پێغەمبـەری کـرد (ﷺ) کـە فـەرمووی: ((اقرا باسم ربك الـذی خلـق ......)) کە لەگەڵ گەورەترین بنـچینەی بۆچوونە

ئیسلامیەکاندا دەگونجێت و هەرخوای گەورە (( هو الأول والاخر و الظـاهر والبـاطن ))... هـەر ئـەوە -سـبحانه- بـوونی حـەق و ڕەوا کـە سـەرجەم بوونـەوەرەکانی تـر بـوونی خۆیـان لـە بـوونی ئـەوەوە وەردەگـرن ، هـەموو سـەرەتایەکیش دەسـت پـێ کردنـی خـۆی لـەوەوە وەردەگـرێ .. کەواتـە هـەر بـەناوی ئـەوەوە هـەموو سـەرەتایەك دەسـت پـێ دەکـات و هـەر بـەناوی ئەویشەوەیە هەموو جوڵەیەك و هەمووو ڕووگەیەك .

ناوبردنی خوا ـ سبحانه ـ لەسەرەتاوە بە ( الرحمن الرحیم ) ـ هەموو مانا و شێوەکانی بەزەیی دەخاتـە دووتوێی خۆیـەوە ـ تـەنها هـەر خوایـە ئـەم دوو سیفەتەی تیا کۆبووبێتەوە، هەروەك چۆن تەنها خۆی تایبەتمەندە بە سیفەتی ( الرحمن ).. ئەوپەڕی بەخشندەیی.. دەشێ یەکێك لە بەنـدەکانی بەمیهرەبان ( رحـیم ) ناوببرێـت ، بـەڵام لەلایـەنی ئیمانیـەوە بـەهیچ جۆرێـك نابێـت هـیچ کەسـێك بـە ئەوپـەڕی بەخـشندە (رحمـن) نـاو ببرێـت.. وە زۆر شـیاوترە کـە هـەردوو سـیفەتەکە تـەنها لـە خۆیـدا کۆببێتـەوە .. هەرچـەندە ڕێنەکـەوتنیش هـەبێت لەسـەر ئـەوەی کـە ئایـا کـام لـەم دوو سیفەتە مانـای بەخـشندەیی تیـا فراوانترە لەوی تر ، وە بەدواداچوونی ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانە ئیشی ئێمە نیـە لەم سێبەری قورئانەدا کە خۆمان تیا حەواندۆتەوە تەنها ئەوەنـەبێ کـە بۆمـان دەردەکەوێ ئەم دوو سیفەتە گەورەیە هەموو ماناو بوارو شێوەکانی بەزەیی و بەخشندەییان خستۆتە دووتوێی خۆیانەوە .

جا گەر سـەرەتایەك بەناوی خـوای گـەورەوە بێـت بـەو هـەموو مانایـەی کـە یەك خوا پەرستی و ئەدەبی بەرز دەردەخات لەگەڵ خوای مەزندا، بریتـی بێـت لـە یەکـەمین بنـچینەی گرنگـی بۆچـوونی ئیـسلامی. ئـەوا کۆبوونـەوەی مانـاو بوارو شێوەکانی بـەزەیی لـە سیفەتی (الـرحمن الـرحیم) دا بریتیـە لەبنـچینەی دووەمــی ئــەو بۆچــوونە .. کــە سرووشــت و چــۆنیەتی ئــەو پەیوەندیــە بەئاشکرایی بڕیاردەدات کەلەنێوان خواو بەندەکانیدا هەیە .

پاش دەستپێکردن بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، ڕووکردنە خوا بە سوپاسگوزاری و باس کردنی بە پەروەردگاری ڕەهای هەردوو جیهان دێت (( الحمدلله رب العالمین )) ..

سوپاس و ستایش کردنی خوا بە ( الحمدلله ) ئەو هەستەیە کە لەدڵی موسوڵمانەوە هەڵدەقوڵێ کاتێ کە ناوی خوا دێت و باسدەکرێ.. هەر بۆیە بوونی ( الحمدلله ) لەسەرەتاوە هەڵقوڵینی کانیاوی ناز و بەهرەکانی خوای بالآدەسەت دەردەخات و هەستی سوپاسگوزاری بێپایان دێنێتە جۆش، هەرچەندە لە هەموو کاتو سات و لەهەر هەنگاوێکدا گەورەیی و بەخشندەیی خوای مەزن پەیتا پەیتا کۆدەبێتەوەو دێتە خوارێ و باڵی بەسەر گشت بونەوەراندا دەکێشێ بەتایبەتیش ئەم مرۆڤە .. بۆیە ( الحمدلله ) لەسەرەتاو لە کۆتاییشدا یەکێکە لە بنچینەی ڕاستەوخۆی بۆچوونەکانی ئیسلامی ((وهو الله لا اله الا هو ، له الحمد في الاولى و الاخرة )) ..

لەگەڵ ئەمەشدا بەخشینی خوا ـ سبحانه ـ بۆ بەندەی موسوڵمانی خۆی دەگاتە پلەیەك كە هەر بڵێ ( الحمدلله ) بەچاكەیەكی وا بۆی تۆماردەكرێ كەسەنگی لەسەرجەم چاكەكانی تر گرانتر بێت. ( ابن عمر ) ـ خوایان لێ ڕازی بێت ـ دەفەرموێت : پێغەمبەر (ﷺ) بۆی گێڕاینەوە كە بەندەیەك لەبەندەكانی خوا جارێك وتی: ( یا رب لك الحمد كما ینبغي لجلال وجهك وعظیم سلطانك ) فعضلت الملكین فلم یدریا كیف یكتبانها. فصعدا الى الله فقالا : ربنا، ان عبدا قد قال مقالة لاندري كیف نكتبها. قال الله ـ وهو أعلم بما قال عبده ـ : (( وما الذي قال عبدي ؟ )) قال : یارب إنه قال ( لك الحمد یارب كما ینبغي لجلال وجهك و عظیم سلطانك)، فقال الله لهما: (( اكتبها كما قال عبدي حتى یلقاني فأجزیه به )).

ڕووكردنە خوای گەورە بەسوپاس و ستایش ئەو هەستەی موسوڵمان پیشان دەدات ، كە بە ناوبردنی خوا دەوروژێ و دێتە جۆش ــ وەك باسمان

کرد ــ بەڵام نیوەکەی تری ئایەتەکە: (( رب العالمین )) بریتیە لە بنچینەی بۆچوونی ئیسلامی ، لەبەر ئەوەی پەروەردگاری ڕەهاو سەرتاسەریی یەکێکە لە بنچینە بنەڕەتیەکانی عەقیدەو باوەڕی ئیسلامی.. وە (الرب) مانای خاوەن هێزێك دەگەیەنێت کە بەدەسەڵاتەو دەستی دەڕوات بەسەر ژێردەستەکانی خۆیدا، لەزمانەوانیشدا بەیەکێکی گەورە دەوترێت کە خاوەن دەسەڵاتەو توانای چاکە کردن و پەروەردەکردنی هەبێت .. خواش ــ سبحانە ــ ئەم بوونەوەرەی بەدی هێناوە هەروا بێ سەرپەرشتیار بەرەڵای نەکردووە ... نا ... بەڵکو بەهەموو شێوەکانی چاودێری و چاکە ویستی ئاگای لێیەتی و دەیپارێزێ‌و ، هەموو گیانلەبەرو بوونەوەرەکان ڕاستەوخۆ دەپارێزرێن و ئاگاداری دەکرێن لەلایەن خوای هەردوو جیهان خۆیەوە. وە ئەم پەیوەندیەی نێوان بەدیهێنەرو بوونەوەرەکانی بەردەوامەو دەمێنێتەوە و لەهیچ کات و سات و شوێنێکدا لێك ناترازێ و جیا نابنەوە ..

پەروەردگارێتی ڕەها دووریان و جیاکەرەوەی نێوان یەکخواپەرستی سەرتاسەرو نێوان ئەو لێڵیەی پەیدا دەبێت کاتێ کە ئەم ڕاستیە بەشێوەیەکی گومانبڕ دروست نەبووبێت .. زۆرجار خەڵکیی لەگەڵ ئەوەی دانیان بەوەداناوە کە خوا تاکە دانەرو داهێنەری گەردوونە، لەهەمان کاتیشدا باوەڕیان بە فرە پەروەردگاری هەبووە کە توانای دەسەڵات و فەرمانڕەواییان هەیە لەژیاندا. لەوانەیە ئەم دیاردەیە نامۆو پێکەنیناوی بێت .. بەڵام ئەم شتە ئەوکاتەو تا ئێستاش هەر هەبووە. بۆیە قورئانی پیرۆزیش باسی دەستەیەك لەهاوتا پەیداکاران دەکا کە دەربارەی پەروەردگارەکانیان دەیان ووت : (( ما نعبدهم الا لیقربونا الی الله زلفی )) .. هەروەك چۆن دەربارەی کۆمەڵێك لەخاوەن پەرتووکەکان ئەفەرموێت (( اتخذوا أحبارهم و رهبانهم اربابا من دون الله )) ..

وەكاتی هاتنی ئیسلام هەرهەموو بیرو باوەڕە جاهیلیەكانی ئەوكاتەی سەرزەوی ئاخێنرابوون بەچەندەهاو جۆرەها پەروەردگار، كە گوایە ئەوانە پەروەردگاری بچوكن و لەگەڵ گەورەی خواوەندەكانـدا كارەكانی خۆیان ئەنجام ئەدەن .

باس كردنی پەروەردگارێتی لەم سوورەتەداو باڵكێشانی بەسەر هەموو جیهاندا دووریانی یەكلاكەرەوەی هەردوو ڕێبازی ڕێك و پێك و دروست ، یا بەرەڵلایی و نابەجێیی لە عەقیدەو باوەڕدا ئاشكرادەكات، تاسەرجەم بوونەوەران ڕووبكەنە تەنها یەك پەروەردگارو دان بەسەرداریێتی ڕەهای ئەودا بنێن و ئەركی گرانی فرە پەروەردگاریی و سەرگەردانی نێو ئەو هەموو پەروەردگارانە لەسەر شانی هەمووان لابدات .. ئەوجا ویژدانی ئەم بوونەوەرانە دڵنیا بێت لە چاودێری بەردەوامی خوای گەورە و دڵنیابێت لە پەروەردگارێتی هەمیشەیی ئەوو بزانێ ئەم چاودێریە هەرگیز نەدەپچڕێ و نە لاواز و نەبزریش دەبێ، نەك وەك بەرزترین بۆچوونی فەلسەفەیی مرۆیی كە ئەرستۆ خاوەنێتی و ئەڵێ: خوا ئەم بوونەوەرەی دروست كرد و پاشان وازی لێهێناو پشتی تێكرد، لەبەرئەوەی خوا زۆر لەوە مەزنترە كە بیر لە شتێ بكاتەوە لەخۆی كەمتر بێت وە تەنها لەخودی خۆی نەبێت بیر لەهیچ شتێكی دی ناكاتەوە! ئەرستۆش كە ئەمە بیرو بۆچونێتی گەورەترین فەیلەسوفەو عەقڵیشی گەورەترین عەقڵە !!!

كاتێ كە ئیسلام سەریهەڵدا زۆر لە بیرو باوەڕو بۆچوون و ئەفسانەو فەلسەفەو ئەندێشەو بیرۆكەكان كەڵەكە بووبوون .. ڕاست و درۆ، دروست و گەندەڵی، ئایین و بیری پوچەڵ ، فەلسەفەو ئەفسانە ، ئەمانە هەموویان تێكەڵی یەكتر بووبوون .. ویژدانی مرۆڤیش لەژێر ئەم هەموو بارە گرانەدا دەینالاند و لەگێژاوی تاریكی و گومان بردندا دەتلایەوەو .. دڵنیاییەكیش نەبوو لە سایەیدا لەنگەر بگرێت و لەم سەرگەردانیە ڕزگاری ببێت ..

بیروبۆچوونی مرۆڤـیش بۆ خواوەنـدو بۆ پـەروەردگار هـەر لـەو گێـژاوەدا پەنگی خواردبۆوە، کە نەئارامی و نەدڵنیایی و نەڕۆشنایی تیا بەدی نەدەکرا، هــەروەها بــیرو بۆچــوونی بــۆ شــێوەی ئــەو خوایــەو پەیوەنــدی بــە بوونەوەرەکانیەوە بەتایبەتیش پەیوەندی نێوان خـواو مرڤـ هـەر لـەو ئاستە نزمەدابوو .

خـۆ نـەدەبا ویژیـدانی ئـادەمیزاد ئـارام بگرێـت لەسـەر کێـشەی ئـەم بوونـەوەرەو کێشەی خـودی خـۆی و بەرنامـەی ژیانیـشی پـێش ئـەوەی ئارام بگـرێ لەســەر کێــشەی عەقیــدەو بــیرو بــاوەڕی و چــۆنیەتی تێگەیــشتن و تێڕوانینــی بـۆ خواوەنـد و دەسـەڵاتەکانی ، وە یـاخود پـێش ئـەوەی بگاتـە رایـەکی کۆتـایی و ڕوون و ئاشـکرا و ڕاسـت و ڕەوان لـەنێو ئـەم هـەموو کـوێر بینیـەو ئـەم سەرلێشێوان و ئـەم بـارە گرانـەی کەڵەکـەیان کردبـوو ، مرۆڤــیش هەسـت بـەم سەقامگیریە ناکـات تـا بـارگرانی ئـەم هـەموو گرفتـە ئاڵۆزانـەی بـۆ دەرنەکەوێت و تانەکەوێتە نـاو دەردی ناهـەمواری ئـەم هـەموو سـەرگەردانیەی کە بەسەر بیرو باوەڕ و بۆچوون و ئەفسانەو فەلسەفەو ئەندێشەو بیرۆکەکانیدا هاتبوون .. کاتێك ئیسلام هاتە ئاراوە ئەم هەموو چڵك و تەمو مـژەی بینـی کـە کەوتۆتــە ســەر ویــژدانی مرۆڤــایەتی هــەروەك چــۆن لەمەوبــەر باسمــان لــە هەنـدێکیان کـرد. ( وە لەمــەو دواش باســی زۆر لایــەنی تـری دەکرێـتو لـەو شوێنانەی کە قورئان باسیان دەکات چارەسەری یـەکجارەکی و دروسـتیان بـۆ دادەنێ ) .

ئیسلام هـەر لـە سـەرەتاوەو لەیەکـەمین هەنگاویـدا ڕەچـاوی ڕزگـار کردنـی کێشەی عەقیـدەو بیروبـاوەڕی کـرد و ئـەو سـنوورەی دیـاری کـرد کـە ویـژدان بۆچــوونی خــۆی لەســەر بنیــاد دەنــێ ســەبارەت بــە کێــشەی بــوونی خــواو ســــیفاتەکانی و پەیوەندیــــەکانی بــــە بوونەوەرەکانیــــەوەو پەیوەنــــدی بوونەوەرانیش بە خوای خۆیانەوە .

کێشەی یەکخواپەرستیی دروست و تەواو و سەرتاسەری خاوێن و بێگەرد، کە بەهیچ شێوەیەك نە لە دوور نە لە نزیك تەمومژی بەسەردا نایەت .. بووە بناغەو بنچینەی سەرەکی ئەو دید و بۆچوونەی کە ئیسلام بەرپای کردو هێنایەدی و، بەردەوام لە ویژداندا جێی بۆ خۆش دەکرد و بەڕوون و ئاشکرایی دەری دەخست و، لەهەر تێکچوون و لێڵیەك دەیپاراست کە ڕاستی یەکخواپەرستی بشڵەقێنێ، تا بەیەکجاری پاکی بکاتەوە لە هەر تەمومژێك با کەمیش بێت ، تا وای لێدێت ئەوەندە پتەوو دامەزراو و چەسپاو بێت ، کە هیچ ئەندێشەیەك بە هیچ شێوەیەك تێکەڵاوی نەبێت .. هەروەها ئیسلام بەهەمان ڕوونی و ئاشکرایی و ڕاست و ڕەوانی بێ گرێ ڕای خۆی دەردەبڕێ سەبارەت بە سیفەتەکانی خوا بەتایبەتی ئەوانەی کە تایبەتن بە پەروەردگارێتی ڕەهاوە چونکە زۆربەی گرفتە کەڵەکەبووەکان لەو سەرگەردانیەدا بوون کە فەلسەفەو بیرو باوەڕەکان تیایدا دەتلانەوە ، هەروەك چۆن ئەندێشەو ئەفسانەکانیش لەهەمان بارودۆخدا بوون سەبارەت بەو کێشە گرنگ و سامناکە .. ئەو کێشەیەی کاریگەرییەکی ئێجگار توندی هەیە لەسەر ویژدان و ڕەفتارو ڕەوشتی مرۆڤایەتی بەگشتی .

هەر کەسێکیش چاوی بەو هەوڵە بەردەوام و دوورو درێژەی ئیسلام بکەوێت کە پیادەی کرد بۆ چەسپاندنی وتەی ڕاست و دروست و چەسپاو و نەگۆڕ ، دەربارەی خودی خواو سیفات و پەیوەندیەکانی بە بوونەوەرانیەوە ، ئەو هەوڵەی کە لەزۆر لە ئایەت و دەقەکانی قورئاندا ڕەنگ دەداتەوە .. ئەوەی سەیری ئەم هەوڵ و کۆششە بێ وێنەیە دەکات بەبێ ئەوەی سەیرێکی ئەو گرفتە سەخت و دژوارانەی کۆبووبوونەوە لەنێو ئەو سەرگەردانیە هەمەلایەنەدا کە سەرجەم مرۆڤایەتی بەدەستیەوە دەیناڵاند.. لەوانەیە هەست بەگرنگی و پێویستی ئەو هەموو ئاشکرا کردن و دووپات و ورد کردنەوە و بەدواچونەدا نەکات لە سەرجەم ڕێڕەوەکانی ویژداندا.. بەڵام

گەڕانەوەیەك بۆ گرفتە سەخت و کەڵەکە بووەکان ، گرنگی و گەورەیی ئەو هەوڵ و کۆششە بەردەوامە باش دەردەخات، هەروا ئەو ڕۆڵە مەزن و بەنرخەی بۆ دەردەکەوێت کە ئەم عەقیدەیە گێڕای وە دەشیگێڕێ لە ڕزگارکردنی ویژدانی مرۆڤایەتی و پساندنی ئەوکۆتەی پێوەی بەندکرابوو، دواتریش ئارامی و حەواندنەوەی پاش ئەو ماندوو بوونەی بەملیدا هاتبوو لە ئاکامی سەرگەردانیەکەی نێوان ئەو هەموو فرە پەروەردگارو ئەندێشەو ئەفسانانەدا!!!

جوانی و نیانی ئەو عەقیدەو بیرو باوەڕەو بەرزی و بێ هاوتایی و ڕێك و پێکی و سانایی ئەو ڕاستیانەی نمایشیان دەکات .. ئەمانە هەموویان بۆ دڵ و دەروون و مێشك و هزر باش دەرناکەوێ گەر ئاگایان لەو فرە گرفتی و نەفامیە نەبێت کە لە بیرو باوەڕو بۆچوون و ئەفسانەو فەلسەفەکاندا هەبوون !! بەتایبەتیش کێشەی ڕاستیی خوایەتی و پەیوەندی بەجیهانەوە .. ئالەم کاتەدا عەقیدەو بیروباوەڕی ئیسلامی وەك بەخشش و بەهرەیەك دەردەکەوێت.. وەك بەخشش و بەزەییەکی ڕاستەقینە بەدڵ و بەمێشك .. بەزەییەك پڕ بێت لە جوانی و سادەیی، لەڕوونی و ڕێك و پێکی ، لەدۆستی و ئاشنایی ، لە وەڵامدانەوەی تەواو و ڕاستەوخۆ و قوڵ و تێرو تەسەل بۆ سروشتی پاك و فیترەت .

(( الرحمن الرحيم )) .. ئەم سیفەتە کە سەرجەم ماناکانی بەزەیی و بەخشندەیی و میهرەبانی بەگشت لایەن و بوارەکانیەوە دەگرێتە ئامێز ، لێرەدا و لەکرۆکی سوورەتەکەدا دووبارە دەبێتەوە، لە ئایەتێکی سەربەخۆدا، بۆئەوەی بەتەواوی دان بنێت بەو پەروەردگارییە سەرتاسەرییەدا و بنچینەکانی ئەو پەیوەندیە بەردەوامەی پێ بچەسپێنێ کە لەنێوان پەروەردگارو پەروەردەکراوانیداو نێوان بەدیهێنەرو بونەوەرانیدا هەیە .. کە پەیوەندیەکی ئەوەندە پڕ بەخشندەیی و پڕ لە چاودێرییە ، هەستەکانی

سوپاس و ستایشی بەردەوام دێنێتە جۆش .. ئەو پەیوەندیەی لەسەر بناغەی دڵنیایی و ئارامیی دامەزراوەو خۆشەویستی و سۆزی لێ هەڵدەقوڵێ . کەواتە سوپاسگوزاری وەڵامدانەوەیەکی سروشتیی و فیتریە بۆ ئەو بەزەیی و بەخشندەیی و میهرەبانیە بێ وێنەو گەورەیەی خوای پەروەردگار .

خوای پەروەردگار لە ئاینی ئیسلامدا بەندەکانی خۆی وەك دوژمنێك سەیرناکاو ڕاویان نانێ و دەربەدەریان ناکات ، هەروەك خواوەندەکانی (ئۆڵەمپ ) ڕەفتاریان دەکرد لەکاتی هەڵچوونی ئارەزووەکانیاندا، وەك ئەفسانەکانی گریك باسی لێدەکات.. یاخود پیلانی تۆڵە سەندنەوەیان بۆ داناڕێژێ هەروەك ئەفسانە هەڵبستراوەکانی نێو ( پەیمانی کۆن ) کە ( تەوراتە ) دروستیان دەکات، وەك نمونەی ئەفسانەی ( بورجی بابل ) کە لە {ئیسحاحی یازدەیەمین لە ( سفر التكوين )} دا باس دەکات *.

(( مالك يوم الدين )) .. ئەمەش ڕاستیەکی ئێجگار گەورەیەو کاریگەریەکی زۆری هەیە لەژیانی مرۆڤدا، ڕاستی باوەڕهێنان بە ڕۆژی دوایی .. ( الملك ) مانای بەرزیترین پلەکانی دەسەڵات و هەبوون دەگەیەنێت، (يوم الدين) بریتیە

* مرۆڤ لەسەر گۆی زەوی هەموو بەیەك زمان دەئاخافتن و بەیەك شێوە دەدوان ، کاتێك کە لە ڕۆژهەڵاتەوە کۆچیان کرد پارچە زەویەکیان لەناوچەی ( شەنعار) دۆزیەوەو ، هەر لەوێ هەڵیانداو جێگیر بوون ، هەندێکیان وتیان : دەبا خشتی سوور بە قوڕ دروست بکەین و بەئاگر خۆشی بکەین ، ئەوەبوو لەجیاتی بەرد خشتیان دروست کرد، ئینجا وتیان، دەبا شارێك دروست بکەین و ، بورجێکیش کە سەری لە ئاسمان گیربێت ، باناوێکیش بۆخۆمان هەڵبژێرین تا پەرت و بڵاو نەبینەوە لەسەر زەویدا. ئالەم کاتەدا پەروەردگار هاتە خوارێ ئەو شارو بورجەی بینی کە ئادەمیزاد دروستیان دەکرد ، ئینجا پەروەردگار وتی: ئائەمانەن یەك نەتەوە کە بەیەك زمان دەدوێن ، ئائەوەش ئیش و کاریانە، وا دیارە واز لەو ئیشەیان ناهێنن تا تەواوی نەکەن ، دەبا بچین ئیشەکەیان لێ تێکدەین و سەریان لێ بشێوێنین ، تا کەس لەکەس تێنەگات . ئەوەبوو پەروەردگار پارچە پارچەو پەرت و بڵاوی کردن و وازیان لە دروست کردنی شارەکەش هێنا، هەربۆیە شارەکە ناونرا ( بابل ) چونکە خواوەند( بلبل لغة الأرض ) ( یانی زمانی خەڵکی سەرزەوی هەموو تێکەڵ و پێکەڵ کرد) . هەر لەوێشەوە پەروەردگار ئاوارەی کردن و هەریەکەیانی بەلایەکدا پەرتەوازە کرد .

لە ڕۆژی پاداشت دانەوە لە ڕۆژی دواییدا .. زۆر جار خەڵکیی باوەڕیان بە خواوەندێکی پەروەردگار هێناوەو دانیان بەوەداناوە کە هەر ئەوە بۆ یەکەمین جار ئەم گەردوون و بوونەوەرەی بەدیهێناوە، بەڵام ــ لەگەڵ ئەوەشدا ــ بڕوایان بە بوونی ڕۆژی سزاو پاداشت دانەوە نەبووە، قورئانیش دەربارەی ئەو جۆرە کەسانە دەفەرموێت : (( ولئن سألتهم من خلق السموات والأرض ليقولن : الله )) .. جارێکی دی و لە شوێنێکی تردا باسیان دەکات و ئەفەرموێ : (( بل عجبوا أن جاءهم منذر منهم فقال الكافرون : هذا شئ عجيب ، أ اذا متنا وكنا ترابا ؟ ذلك رجع بعيد )) .

باوەڕهێنان بە ( يوم الدين ) ڕاستیەکە لە ڕاستیە مەزنەکانی عەقیدەی ئیسلامی کە زۆر گرنگە بۆئەوەی مرۆڤ وای لێبێت چاو و دڵ و دەروونی پەیوەست بن بە جیهانێکی تر پاش جیهانی سەر زەوی ، تا پێویستیەکانی ژیانی سەر زەوی زاڵ نەبێت بەسەریاندا ، چونکە ئەوکاتە مرۆڤ خۆی دەسەڵاتی بەسەر ئەو پێویستیانەدا دەبێ و مل کەچیان نابێت و بەچاوێکی بەرزەوە سەیریان ناکا و ناچێتە ژێرباریانەوە و تووشی دڵەڕاوکێش نابن دەربارەی هاتنەدی پاداشتی ئەو هەوڵ و کۆششەی داویانە لەماوەی تەمەنی کورتی نێو چوارچێوەی تەسکی ئەم زەویەدا. هەر ئەوکاتەش دەتوانن کار و چالاکیەکانیان لەپێناوی خوای گەورەدا ئەنجام بدەن و هەر بۆ ڕەزامەندی ئەوبێت و چاویان لە پاداشتی پیرۆزی ئەو خوایە بێت ، لەو شوێن و کاتەی کە خۆی ئارەزووی دەکاو دایدەنێ ، لەسەر زەوی بێت یاخود لەڕۆژی دواییدا بێت و، زۆر بە دڵنیایی و بەوپەڕی دڵ فراوانی و لێبووردوویی و چاونەترسینەوە چاو ببڕنە چاکە خوازی و پێداگرتن لەسەر هەق . ئەم ڕاستیە گەورەیەش دووڕیانی یەکلاکەرەوەی نێوان بەندایەتی بۆ ئارەزوو ئاواتەکان و نێوان ئەو سەربەستیە مرۆڤایەتیەی کەشایەنی ئادەمیزادە. دووڕیانە لەنێوان مل کەچی بۆ بۆچوون و تێڕوانینە نزمەکانی سەرزەوی بەگشت بەهاو

سـەنگ و پێوەرەكانیـەوە و نێـوان پابەنـدبوون بەبـەهاو رەفتـارە پەروەردگاریەكان و زاڵ بوون بەسەر رێڕەوی نەفامی و جەهالەتدا، دووریانی نێـوان مرۆڤـایەتی لەوچوارچـێوە بـەرزو بڵنـدەی خـوای پـەروەردگار بـۆ بەنـدەكانی نەخـشە كێـشاوەو نێـوان ئـەو وێنـە ناشـرینكراوەو تێكـدراوەی كەهەرگیز بڵندیو بەرزی بەخۆیەوە نەدیوە .

هیچ كاتێك ژیانی مرۆڤـایەتی لەسەر بەرنامەی پاكی خوا لەنگەر ناگرێ و و راست نابێتەوە تا ئەم راستیە گرنگە لە مێشك و بۆچوونیدا پیادە نـەكرێ و سـەقامگیر نـەبێ و، تـا دڵنیـا نـەبێ لـەوەی كـە ئـەو پاداشـتەی لەسـەر زەوی دەیاندرێتەوە هەر ئەوە نیە كە چاوەڕێی دەكەن و بۆیـان دانراوە . وە تـا ئـەم مرۆڤـە كـەم تەمەنـە دڵنیـا نـەبێت لـەوەی ژیـانێكی هەمیـشەیی و نـەبڕاوەی لەبەردەم دایە و شایەنی ئەوەیە هەوڵی بۆ بدا و قوربانی بدات بۆسەرخستنی هـەق و چاكەخوازی و پشت بـەو پاداشـتە ببەسـتێت كە لـەو ژیانـەدا دەسـتی دەكەوێت ..

ئەوانـەی كـە بـاوەڕی چەسـپاویان بـە ڕۆژی دوایـی هەیـەو ئەوانـەی كـە باوەڕیـان پـێ‌ی نیـە، هـەرگیز ئـەو دووانـە وەك یـەك نـین ، هـەمان هەسـت و رەوشت و ئاكارو كردەوەشیان نابێـت.. چونكە ئەوان دوو جۆری جیاوازیـان لەبوونەوەران و، دوو سروشتی جیاوازن و، نە لەكرداردا بەیەك دەگەن لەسـەر زەوی و نـە لەپاداشتیـشدا بەیـەك دەگـەن لـەڕۆژی دواییـدا.. هـەر ئەمەشـە ئـەو دووریانەی كە جیایان دەكاتەوە ..

(( ایاك نعبـد و ایـاك نستعین )) .. ئەمـە ئـەو بنـەما عەقیـدی و بیرو بـاوەڕە گرنگەیـە كـە لـە بنـەماكانی پێـشووتری سـورەتەكەوە سەرچـاوە دەگرێـت ودروست دەبێت.. كە هـەر جۆرە پەرستنێك دەبێ هـەر بۆ خـوای گـەورەبێت، هـەر پاڵپشت و یارمەتیدەرێك هەر ئەبێ ئەوبێت .

لێرەوەو بۆجارێکی تر دووریانێکی دی دەست پێ دەکات.. دووریانی نێوان ڕزگاربوونی یەکجارەکی لەهەر پەرستنێك و نێوان پەرستنی یەکجارەکی بۆ بەندەکانی، ئەم بنەما گشتیە بانگەشەی لەدایك بوونی ڕزگاریەکی تەواوی سەرتاسەریە بۆ گشت ئادەمیزاد . سەربەستی لەپەرستنی ئەندێشەکان .. لەپەرستنی یاساکان، لەپەرستنی بارودۆخ و هەل و مەرجەکان.. وە ئەگەر تەنها خوای مەزن شایانی پەرستن بێت ئەوا ئەبێ هەر ئەویش شایانی پەنا بۆبردن و پاڵپشت بێت . ئیتر هەر ئەو ساتە و ئەو کاتە ویژدانی مرۆڤایەتی ڕزگاری بووە لە مل کەچی و سەرشۆڕی بۆ یاسا و بارودۆخ و کەسەکان، هەروەها ڕزگاربوونیشێتی لە مل کەچی بۆ ئەندێشە و ئەفسانە و بیرە پووچەڵەکان .

هەر لەم شوێنەدا هەڵوێستی مرۆڤی موسوڵمان دەردەکەوێت بەرامبەر هێزە مۆرڤایەتیەکان و هێزە سروشتیەکان ، هێزە مرۆڤایەتیەکان ـ گەر بەرامبەر موسوڵمان بپێوڕێن ـ دوو جۆرن : هێزێك ڕێباز و بەرنامەی خۆی دۆزیوەتەوە و باوەڕی بەخوا هەیە وشوێنکەوتووی بەرنامەی خوایە.. جاپێویستە موسوڵمان دەست لەناو دەستیان بنێ و یاریدەدەریان بێت بۆ هەموو خێرخوازی و هەق و چاکە کردنێك.. وە یا هێزێکی گومڕاو سەرگەردان و سەرلێشێواوە کە هیچ پەیوەندیەکی بەخواوە نیەو لێی داپچڕاوە و دوای بەرنامەی خوای گەورە نەکەوتووە.. ئەمانەش پێویستە لەسەر موسوڵمان بەرەنگاریان بوەستێت و نەیانهێڵێ و هێرشیان بکاتە سەر . وە هەرگیز مرۆڤی موسوڵمان نابێت ئەو هێزە سەرلێشێواو و چەواشەکارانە بەگەورەو زەبەلاح و ترسناك دابنێ ، چونکە هەر بە دوورکەوتنەوەیان لە سەرچاوە مەزن و پیرۆزەکە ـ کەخوای گەورە خاوەنێتی ـ هێزی ڕاستەقینەیان پێ نامێنێ .. ئەو خۆراك و وزە بەردەوامەی بزر دەکات کە هێز و توانای پێ دەپارێزێت ، هەروەك چۆن کە پارچە ئەستێرەیەکی گەورە لە

ئەستێرەیەکی گڕدار جیا دەبێتەوە ، هەر ئەوەندە لێی جودا بۆوە دەست بە کزی و کوژانەوە دەکات تا بەتەواوی سارد ئەبێتەوە و وزە و ڕووناکی تیا نامێنێ ، هەرچەندە کێش و قەبارەشی مەزن و گەورەبێت، بەڵام هەر گەردیلەیەك با زۆر بچوکیش بێت کە هێشتا جیا نەبووبێتەوە و بەسەرچاوە سەرەکیەکەیەوە لکابێت، ئەوا هەموو هێز و ڕووناکی و تینی گەرمایی خۆی هەڵدەگرێ و دەمێنێتەوە :(( کم من فئة قليلة غلبت فئة كثيرة باذن الله )) .. ئەم هێزە کەمە بەچی سەرکەوتنی بەدەست هێنا ؟ .. بێ گومان هەر بەوەی کە دانەبڕاو بوو لەسەرچاوەی یەکەمین هێز و کۆمەکی و یارمەتی لەتاکە سەرچاوەی گشت هێز و سەربەرزی و سەرفرازیەك وەرگرتبوو .

بەڵام هێزە سرووشتیەکان ، ئەبێ هەڵوێستی موسوڵمان بەرامبەریان هەڵوێستی ناسین و دۆستایەتی و ئاشنایی بێت ، نەك دوژمنایەتی و لێترسان، چونکە هێزی مرۆڤ و هێزی سروشت هەردووك لەویستی خوا و ئارەزووی ئەوەوە پەیدا بوون .. هەر بەفەرمان و ئارەزووی خواوە بەڕێوە دەچن ، هەردووکیش بەوپەڕی ڕێکی و شان بەشانی یەکدی و دەست لەناو دەست بەرەو یەك ڕووگەو بەهەمان جوڵەو بزاڤتن کاردەکەن . عەقیدەو باوەڕی موسوڵمان وای فێردەکات کە خوای گەورە ئەم هەموو هێزەی بۆ ئاشنایی و یاریدەو کۆمەکی کردنی ئەو بەدیهێناوە. ئەو ڕێڕەوەش کە دەیگرێتەبەر بۆ ئەم ئاشنایی و کۆمەکیە هەردەبێ بە تێڕوانین و ناسین و دەستخستنە ناو دەستی ئەوەوە بێت ، وە هەردووك بەرەو تاکە خوای هەردووکیان هەنگاوبنێن و ڕوو لەیەك خوای مەزن و باڵادەست بکەن .

وە ئەگەر هەندێ جاریش مرۆڤ وا هەست دەکات ئەو هێزە سروشتیانە ئازارێکی داون ، ئەوە تەنها لەو کاتانەدایە کە بەتەواوی تێیان نەگەیشتووە و باش ئاشنایان نەبووە و ئەو یاسا و بەرنامەیەی نەدۆزیوەتەوە و نەناسیوە کە ئەو هێزانە لەسەری دەڕۆن و هەڵیان دەسوڕێنێت .

ڕۆژئاواییەکان ـ پاشماوەی نەفامی و جاهیلیەتی ڕۆمانی ـ وا فێربوون کە بەکارهێنانی ئەم هێزە سروشتیانە بەزاراوەی (( بەزین یا تێکشکاندنی سرووشت )) ناو ببەن .. ئەم زاراوەیە بەڵگەیەکی ئاشکرایە بۆ سیمای ئەو تێڕوانینە نەفام و نەزانەی کە لەخوای تاك و تەنها پچڕاوە و پابەندی نیە ، دابڕاوە لە ڕۆح و گیانی ئەو گەردوونەی مل کەچی ویستی خوای گەورەیە .. بەڵام مرۆڤی موسوڵمانی پابەندی دڵو دەروون بەخوای پەروەردگار و بەخشندە و میهرەبان ، دڵ و گیان و دەروون پەیوەست بە گیانی ئەم بوونەوەرە ، مل کەچی ویست و ئارەزووی خوای پەروەردگاری هەردوو جیهان.. باوەڕی بەوە هەیە کە پەیوەندیەکی دیکە هەیە جگە لە پەیوەندی تێکشکاندن و بەزین و دابڕان ، باوەڕی بەوە هەیە کە خوای مەزن بەدیهێنەری سەرجەم ئەو هێزانەیە، هەموویانی لەسەر یەك یاسا بنیات ناوە ، تا بەیەکەوە کۆشش بکەن بۆ گەیشتن بەو ئامانجەی کە بەگوێرەی ئەو یاسایانە هەر لەسەرەتای دروست بوونیانەوە بۆیان دانراوە، ئەو کەرەستانەشی بۆ ئاسان و سووکە دەست کردوون کە نهێنیەکانیان ئاشکرا دەکا تا یاسا و بەرنامەکانیان بدۆزێتەوە و بۆ بەرژەوەندی ژیانی خۆی سازیان بدات، نەك تێکیان بداو بیان بەزێنێت ! .. (( سخر لكم ما في الأرض جميعا )) ..

کەواتە بیرو ئەندێشەی پووچ و بێ مانا هەست و هۆشی ئەم مرۆڤە داگیر ناکا بەرامبەر هێزە سروشتیەکان و، هیچ ترس و لەرزێکیشی نابێت لەئاستیاندا .. ئەو بڕوای بە خوایەکی تاك و تەنها هەیە و، هەر ئەو خوایە دەپەرستێت، هەر ئەو بە پاڵپشت و یاریدەدەری خۆی دەزانێت.. ئەم هێزانەش هەر هەموویان دروست کراوی ئەو خوایەن. بۆیە لێیان دەڕوانێ و ئاشنایان دەبێ و نهێنیەکانیان ئاشکرا دەکا و شارەزایان دەبێت، ئەوانیش یاریدەی دەدەن و نهێنیەکانی خۆیانی دەخەنە بەردەست و بۆی ئاشکرا دەکەن، بۆیە هەر بەیەکیشەوە گوزەرانێکی دۆستانەو ئاشنایەتی

دەبەنەسەر.. ئەو وتە بەرزەی پێغەمبەر (ﷺ) چەند جوانە کاتێك سەیری چیای (ئوحود) دەکا و دەفەرموێ :(( هذا جبل احد يحبنا و نحبه )) . ئالەم چەند وشەیەدا هەموو ئەو خۆشەویستی و ئاشنایی و بەزەییە دۆستانەیە دەردەکەوێت کە دەروونی یەکەمین مرۆڤــی موسوڵمان (محمد) (ﷺ) هەڵی گرتبوو، کە پڕ بوو لە خۆشەویستی و ئالوودەیی و تامەزرۆیی و دۆستایەتی بۆ پەیوەندی نێوان خۆیی و ئەم سروشتە پاك و جوانە لەگەورەترین و دیارترین شێوەیدا .

پاش بڕیاردانی ئەو بنەما گرنگ و سەرەکیانەی بۆچوونی ئیسلامیی و بڕیاردانی بەتەنها ڕووکردنە خوای گەورە بەپەرستن و پشت پێ بەستن ، دەست بە پیادەکردنی کردەوەیی دەکات لە ڕووکردنە خوای مەزن ، بەنزا و پاڕانەوە بەشێوازێك کە پڕاوپڕی کەش و هەواو سروشتی سورەتەکەیە (( إهدنا الصراط المستقيم )) .. یارمەتیدەرمانبە بۆ ناسینی ڕێگای ڕاست و گەیەنەر ، کۆمەکیمان بکە بۆ بەردەوام بوون و مانەوەمان لەسەر ئەو ڕاستە ڕێیە پاش ناسین و شارەزابوونی دروست و تەواومان .. چونکە ناسین و بەردەوامی و مانەوە هەردووك بەرهەمی چاودێری و بەزەیی و ڕێنمایی خوای گەورەن .. وە بەرەو لای خوا چوون لەم کارەدا بەرهەمی ئەو بیروباوەڕەیە کە تەنها خوا بەپاڵپشت و یاریدەر بزانرێت . ئەم کارەش یەکەمین و گەورەترین داوایە لەو کاتانەی کە مرۆڤــی باوەڕدار پێویستی بە یارمەتی خوا دەبێت بۆ جێبەجێکرن و هاتنەدی خواستەکانی ، ڕێگرتنەبەر بەرەو ڕێگای ڕاست مانای مسۆگەر کردنی بەختەوەریە لە دونیای سەرزەوی و لە ڕۆژی دوایشدا.. لەڕاستیدا ئەم ڕێنماییە خواییە ڕێنمایی کردنی فیترەت و سروشتی پاکژی ئادەمیزادە بەرەو یاسای خوا ، ئەو یاسایەی هەوڵی مرۆڤ و بزاڤــی گشت بوونەوەران ساز ئەداو ئەگونجێنێ ، تا هەموویان

هاوشانی یەكدی و لەیەك كارواندا بەرەو خوای پەروەردگاری هەردوو جیهان هەنگاو بنێن و بكەونە ڕێ .

هەروەها پەردە لەسەر چۆنیەتی ئەو ڕاستە ڕێیە لادەدا و دەیناسێنێ : ((صراط الذين انعمت عليهم غير المغضوب عليهم ولاالضالين )) .. كەواتە ڕێی ئەو كەسانەیە كە خوای مەزن نازو بەهرەی خۆی داونەتێ . نەك ئەوانەی لێیان تووڕەیە ، چونكە ئەوانە دوای ئەوەی هەق و ڕاستیان بۆ دەركەوت و باش ناسیان ، هەستان پشتیان تێكردو لێیان لادا !.. یاخود ئەوانەی لە هەق و ڕاستی لایان داوە و هەر بەلایدا نەچوون و سەریان لەخۆیان شێواندوە و گومڕابوون .. كەواتە ئەو ڕێیەیە ڕێگای بەختەوەران و ڕێ ڕۆشن و بەهرەدارانە ..

ئیتر ئەمە ئەو سورەتەیە كە خوای گەورە هەڵیبژاردووە تا لە هەر نوێژێكدا بخوێنرێ و دووبارە ببێتەوە گەرنا ئەوا ئەو نوێژە بێ ناوەرۆكە و بەهیچ دانانرێ ، وە لەگەڵ كورتی ئایەتەكانیدا ئەو هەموو مانا بەرز و بنەما سەرەكیانەی بۆچوونە ئیسلامیەكانی تیا بڕیاردراوە و ئەو ئاڕاستە هەستی و نەستیانەش دەگرێتەوە كە لەو بۆچوونانەوە هەڵدەقوڵێن .

لەپێغەمبەرەوە (ﷺ)[1] (يقول الله تعالى : قسمت الصلاة بيني و بين عبدي نصفين: فنصفها لي و نصفها لعبدي، و لعبدي ما سأل .. اذا قال العبد: الحمدلله رب العالمين ، قال الله : حمدني عبدي . و اذا قال : الرحمن الرحيم . قال الله : اثنى علي عبدي. فاذا قال: مالك يوم الدين . قال الله : مجدني عبدي. واذا قال : اياك نعبد و اياك نستعين . قال : هذا بيني و بين عبدي و لعبدي ما سأل . فاذا قال: اهدنا الصراط المستقيم . ((صراط الذين انعمت

---

[1] (صحيح مسلم) من حديث العلاء بن عبدالرحمن مولى الحرقة عن ابيه، عن ابي هريرة عن رسول الله (ﷺ) .

عليهم غير المغضوب عليهم ولاالظــالين . قال : هذا لعبدي و لعبدي ما سأل ))
.. لەوانەیـە ئـەم وتـە بەنرخـەی پێغەمبـەر (ﷺ) -دوای ئـەوەی لـە دوتـوێی سورەتەکەدا ئەو هەموو مانایانەی ڕوون بۆوە- ئاماژە کردنێك بێت بۆ یـەکێك لـە نهێنیـەکانی هەڵبـژاردنی ئـەم سـوورەتە کـە مرۆڤـــی موسـوڵمان و خـاوەن بـاوەڕی ڕاســت لـەماوەی شــەو و ڕۆژێکـدا بەلایـەنی کەمـەوە حەڤـــدە جـار دووپــاتی دەکاتــەوە و دەیــان خوێنێــت ، لــەوە زیــاتریش گــەر بیــەوێ لــە نوێژەکانیدا لەبەرامبەری خوای خۆیدا پتر ڕاوەستێ و بپاڕێتەوە ..

*         *         *

## سورەتی بەقەرە (البقرة)
## مەدەنیە - ٢٨٦ ئایەتە

( بسم الله الرحمن الرحيم )

ئەم سورەتە لەو سورەتانەیە کە هەر زوو پاش کۆچ کردن هاتنە خوارێ ، بێ گومان درێژترین سورەتی قورئانەو ڕاستریش وایە کە ئایەتەکانی یەك لەدوای یەك نەهاتونەتە خوارێ تاکۆتایی دێت بەڵکو ناو بەناو چەند ئایەتێك لە سورەتەکانی دی هاتونەتە خوارێ پێش ئەوەی ئەم سورەتە تەواو بووبێت، چونکە پێداچوونەوەی هۆی هاتنە خوارەوەی هەندێك لە ئایەتەکانی ئەم سورەتە و ئایەتەکانی هەندێك لە سورەتەکانی تری مەدینە ـ هەرچەند ئەم هۆیانە بەتەواوی نەسەلمێنراون ـ ئەوە ڕوون دەکەنەوە کە ئایەتەکانی سورەتە مەدەنیە درێژەکان ڕاستەوخۆ یەك لەدوای یەك نەهاتوونە خوارێ بەڵکو ناوبەناو چەند ئایەتێك لەسورەتێکی تریش دەهاتنە خوارێ . وە بۆ ڕێکخستنی سورەتەکان بەگوێرەی هاتنەخوارەوەیان پشت بە کاتی هاتنەخوارەوەی سەرەتاکانیەوە بەسترا ـ نەك هەمووی ـ هەر لەم سورەتەشدا چەند ئایەتێك هەیە کە لە ئایەتە دواییەکانی قورئانن وەك ئەو ئایەتانەی باسی سوخواردن دەکات ( ايات الربا ) . کەچی ئەوەی سەلمێنراوە ئەوەیە کە سەرەتاکانی لەو ئایەتانەن کە یەکەمین جار لەشاری مەدینەدا هاتنە خوارێ .

بەڵام کۆکرنەوەی سەرجەم ئایەتەکانی هەر سورەتێك و ڕێکخستنیان کارێك بوو پابەندی وەحی پیرۆز بوو[1] (ابن عباس) ـ خوای لێ ڕازی بێت ـ فەرموویەتی: بە عوسمانی کوڕی عەفانم ووت : چی وای لێ کردن کە سورەتی

---

[1] روى الترمذي- باسناده- عن ابن عباس- رضي الله عنهما-

( الانفال ) ــ كه له (دووباره)ەكانه ــ بخەنه پالْ سورەتی (( بەرائه )) كه لەسەدەكانەو دێری ـ بسم الله الرحمن الرحیم ـ تان نەنووسی له نێوانیانداو خستتانه سەر حەوت سورەتە درێژەكان؟ چۆن ئەمەتان كرد؟ عوسمان وتی : پێغەمبەر (ﷺ) گەر سورەتێكی درێژی بۆ بهاتایەتە خوارێ ئەو كەسانەی بانگ دەكرد كه قورئانیان دەنوسیەوە و ئەیفەرموو: ئەم ئایەتە بخەنە نێو ئەو سورەتەی ئاواو ئاوا ئەڵێ. سورەتی ئەنفالیش هەرزوو لەمەدینە هاتە خوارێ و، بابەتەكانیشیان هەمان بابەت بوون، منیش ترسام هەر لەم سورەتە بێت، كه پێغەمبەریش (ﷺ) گیانی پاكی سپارد هێشتا بۆی ڕوون نەكردبووینەوە كه لەو سورەتەیە یان نا، هەر لەبەر ئەوەش بوو نزیكم كردنەوەو ــ بسم الله الرحمن الرحیم ــ م له نێوانیاندا دانەنا و لەگەڵ حەوت سورەتە درێژەكەدا دامنان .

ئەم باسە ئەوە ڕوون دەكاتەوە كەو ڕێكخستنی ئایەتەكان لە هەر سورەتێكدا بەفەرمانی پێغەمبەربووە (ﷺ)، ( ابن عباس )[1] ــ خوای لێ ڕازی بێت ــ ئەڵێ : پێغەمبەر (ﷺ) دەست بلاوترین كەس بوو بۆ چاكەخوازی و بەخشین بەتایبەتیش لەمانگی ڕەمەزاندا و كاتێكش كه حەزرەتی جوبرائیل دەهاتەلای ، وە جوبرائیل –سەلامی خوای لێ بێت– هەموو شەوانێك لە ڕەمەزاندا دەهاتەلای هەتا مانگ تەواو دەبوو، پێغەمبەریش (ﷺ) ئەو قورئانەی بۆی هاتبووە خوارێ بۆی دەخوێندەوە و لێكیان دەدایەوە، جا بۆیە كه جوبرەئیل دەگەیشت ـ سەلامی خوای لێ بێت ـ پێغەمبەر (ﷺ) لەڕەشەبا خێراتر دەبوو بۆ بەخشینی چاكەو چاكە كردن . ئەوەش گومانی تێدا نیە كە پێغەمبەر (ﷺ) هەموو قورئانی بۆ جوبرائیل ــ سەلامی خوای لێ بێت ــ

[1] ( الشيخان ) گێراویانەتەوە .

خوێندۆتەوە و ئەویش بۆ پێغەمبەری خوێندۆتەوە ، ئەمەش مانای ئەوەیە ئایەتەکانیانی بەو شێوازە خوێندۆتەوە کە لە سورەتەکاندا هاتووە .

پاشانیش ئەوەی لەژێر سێبەری قورئاندا بژی تێبینی ئەوە دەکات کە هەر سورەتێك لە قورئان کەسایەتیەکی تایبەتی خۆی هەیە! کەسایەتیەکی زیندوو ، وا لە دڵ و دەروون دەکات هەر دەڵێی لەگەڵ گیانێکی زیندووی خاوەن سیماو سیفات و هەناسەی تایبەتی خۆیەتی! هەروەها هەر سورەتێك یەك بابەت یاخود چەند بابەتێکی سەرەکی هەیە کە تەوەرەیەکی تایبەت دەیانبەستێت بەیەکەوە و کەش و هەوایەکی تایبەتی خۆی هەیە کە باڵ دەکێشێت بەسەرجەم بابەتەکانیداو، وا دەکات هێڵە گشتیەکانی لەچەند لایەنێکەوە باس لەو بابەتە بکەن و ڕێك و ڕەوانیەکی وا دروست دەکات لەنێوانیاندا کە بگونجێت لەگەڵ ئەو کەش و هەوایەدا . هەروەها هەر سورەتێك ئیقاعێکی مۆسیقی تایبەتیشی هەیە ـ گەر بشگۆڕێت ئەوا بۆ مەبەستێکی تایبەتی دەگۆڕێت ـ ئەوەش مۆرکێکی گشتیە لەسەرجەم سورەتەکانی قورئاندا هەیەو هیچ کام لە سورەتە درێژەکانیش لەم یاسایە لانادەن [١] .

ئەم سورەتە گەلێك بابەتی لەخۆ گرتوە .. بەڵام ئەو تەوەرەیەی هەموویان کۆدەکاتەوە بریتیە لە یەك تەوەرەی جوت هێڵ کە هەردوو هێڵە سەرەکیەکانی بە توندی بەیەکەوە بەندن .. لەلایەك باس لە هەڵوێستی بەنی ئیسرائیل دەکات بەرامبەر بانگەوازی ئیسلامی لەشاری مەدینەو چۆن پێشوازیان لێکردو، چۆن بەرەنگاری پێغەمبەر و (ﷺ) ئەو کۆمەڵە ئیسلامیە ساوایە بوونەوە .. باسی هەموو ئەو چالاکیانەشیان دەکات کە پەیوەست بوو بەم

---

[١] بڕوانە بەشی (التناسق الفنی) لە کتێبی (التصویر الفنی فی القرآن) دار الشروق .

هەڵوێستەیانەوە، بەتایبەتیش ئەو پەیوەندیە بەتینەی لەنێوان دووڕووان و جوەکاندا هەبوو لەلایەك و، لەنێوان جولەکە و هاوبەش پەیداکەراندا هەبوو لەلایەکی ترەوە .. وە ئەم سورەتە لەلایەکی تریەوە باسی هەڵوێستی کۆمەڵەی موسوڵمان دەکات لەیەکەم ساتی دروست بوونیەوە و ئامادەکردنیان بۆ هەڵگرتنی ئەرکی گەورەی بانگخوازی و جێنشینی لەسەر ئەم زەویەدا ، پاش ئەوەی سورەتەکە ئەوە ڕادەگەیەنێ کە بەنی ئیسرائیل نەیانتوانی بچنە ژێر باری ئەو ئەرکەوە و ئەو پەیمانەیان شکاند کە لەگەڵ خوای گەورەدا بۆ ئەو مەبەستە بەستبوویان و خۆشیان بێ بەری کرد لە شانازی کردنیان بە گەڕانەوەی ڕەچەڵەکیان بۆ حەزرەتی ئیبراهیم ـ سەلامی خوای لێ بێت ـ کە خاوەنی یەکەمین عەقیدەو باوەڕی پاکی بێ گەردبوو ، هەروەها ئاگادارکردنەوەی کۆمەڵی موسوڵمانیش دەکاتەوە لە تێبینی کردنی ئەو هەڵەو هۆکارانەی وای لە بەنی ئیسرائیل کرد ئەو سەربەرزی و پلەو پایە مەزنەیان لێ وەربگیرێتەوە .. وە سەرجەم بابەتەکانی ئەم سورەتە لەدەوری ئەو تەوەرە جوت هێڵە دەسووڕێنەوە بەهەردوو هێڵە سەرەکیەکەیەوە، هەروەك لەمەودوا بەدوورو درێژی باسی لێدەکرێت .

بۆئەوەی ئەو پەیوەندیە ڕوونبێتەوە کە لەنێوان تەوەرەی سورەتەکەو بابەتەکانیدا هەبوو لەلایەك و لەنێوان ئاڵۆزیەکانی هێڵ و ڕەوتی بانگەوازدا هەر لەیەکەم ساتیەوە لەشاری مەدینەدا و ژیانی کۆمەڵی موسوڵمان و هەل و مەرجەکانی لەلایەکی ترەوە.. وا باشترە ڕۆشناییەك بخەینەسەر سەرجەم ئەو ئاڵۆزیانەی کە هەر لەسەرەتاوە ئەم سورەتە بۆ ئەوە هاتۆتە خوارێ و کە بەرەنگاریان بێتەوە ، لەگەڵ وریاکردنەوەیەکی بەردەوام لەوەی کە ئەم

ئاڵۆزیو گرفتانە بەگشتی هەمان ئاڵۆزیو گرفت کە ئیسلام و هەڵگرانیشی بەدرێژایی سەردەم و بە دووبارە بوونەوەی ڕۆژگارو، لەلایەن دوژمنان و لایەنگرانیشیەوە ، بانگەشەی ئیسلامی و هەڵگرانیشی بەردەوام ڕووبەڕووی دەبنەوە ـ لەگەڵ جیاوازیەکی کەمدا ـ کە وادەکات ئەم ئامۆژگاریە قورئانیانە ببنە دەستووری ئەم بانگەوازە نەمرەو، ژیانێك بکات بەبەر ئەم دەقانەدا کە هەردەم نویێ دەبێتەوە بۆ بەرەنگاربوونەوەی هەموو سەردەم و قۆناغێك و ، ڕایدەگەیەنێت و بەرزی دەکاتەوە تاببنە مەشخەڵی سەرەڕێ لەبەردەم نەتەوەی موسوڵماندا بۆ ڕۆشن کردنەوەی ئەو ڕێگا درێژ و سەخت و دژوارەی گرتویێتیە بەر، لەنێوان ئەو فرە دوژمنایەتیەی کە چەندین شێوەیە بەڵام هەمان سرووشتیان هەیە .. هەر ئەوەشە ئەو ئیعجازەی کەلە یەکێك لەلایەنەکانیەوە دەردەکەوێ کە لەو سیما نەگۆڕە تایبەتەی هەر دەقێکی قورئانی پیرۆزدا دەبینرێ .

کۆچکردنی پێغەمبەر (ﷺ) بەرەو شاری مەدینە پاش ئامادە باشیەکی توندو چەسپاو ڕوویداو، لەژێر کاریگەری بارودۆخێکی وادابوو کە ئەم کۆچ کردنەی سەپاند و وایکرد ببێتە هەنگاوێکی زۆر پێویست بۆ بەردەوام بوونی بانگەوازەکە لەسەر ئەو ڕاستەهێڵەی بۆی نەخشە کێشرابوو کە خوای گەورە خۆی بەڕێوەی ئەبرد و چاوەڕێی دەکرد .. هەڵوێستی سەرسەختی قوڕەیش بەرامبەر بانگەواز لەشاری مەککە ـ بەتایبەتی دوای مردی خدیجە (خوای لێ ڕازی بێت) و مردنی (ئەبو تالیب) سەرپەرشتیارو پارێزەری پێغەمبەر ـ بەوە کۆتایی هات کە بانگەواز وەستێنراو چالاکیەکانی کەم بوونەوە بەتایبەتی لە مەککەو دەوروبەریدا ، هەرچەندە چەند کەسانێك بەردەوام هەر دەهاتنەناو ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە لەگەڵ ئەو هەموو ئەشکەنجەو پیلان گێڕیەی قوڕەیش دەینواند بەرامبەر بانگەوازەکە بەڵام بانگەشەکە ناچالاك و وەستێنراو بوو لەبەر ئەو هاوپەیمانیەی قوڕەیش دروستیان کردبوو بۆ

بەگژاچوونی بەچەندین شێوە و جۆرەها ڕێگا. هەر لەبەر ئەوەش خەڵکی عەرەبی ئەو ناوچەیە زۆر بە هێمنی و بەووریاییەوە چاودێری کێشەکەیان دەکرد ، چاوەڕێی ئەنجامی ئەو دووبەرەکییەیان دەکرد کە لەنێوان پێغەمبەر و خزم و کەس و کارەکانیدا هەبوو، لەسەروشیانەوە (ئەبو لەهەب) و عەمرۆی کوڕی هیشام و ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب و گەلێکی تریش لەوانەی خزمایەتی بەهێزیان هەبوو لەگەڵ خاوەن بانگەوازەکەدا ، هیچ شتێکی واش لەئارادا نەبوو کە ئەو خەڵکە هان بدات لەو دەوروبەرە خێڵەکییەدا ــ کە پەیوەندیەکانی خزمایەتی کێش و سەنگی تایبەتی خۆی هەیە لەناویاندا ــ هانیان بدات بۆ چوونە ناو بیرو باوەڕی پیاوێك کە خزم و کەسەکانی خۆی ئەم هەڵوێستەیان لێ وەرگرتبوو بەتایبەتیش کە هەر ئەو خزمانەی ئەو لێپرسراو و خزمەتکاری کەعبەی پیرۆز بوون ، کە ئەم پیشەیەش لایەنی ئاینی دوورگەی عەرەبیان دەنواند لەو سەردەمەدا .

هەروەها ئەوهەوڵ و گەڕانەی پێغەمبەر (ﷺ) دەیکرد بۆ دابین کردنی بنکەیەکی نوێ جگە لە شاری مەککە، بنکەیەك ئەم عەقیدەیەی تیا بپارێزرێت و سەربەستیی بۆ مسۆگەر بکات و، دەرگا بەسەر ئەو سستی و ڕاوەستانەی کە لەشاری مەککەدا تێی کەوتبوو والا بکات و ڕزگاری ببێت، تا بانگەوازەکە کەش و هەوایەکی سەربەست و ئازادی بۆ برەخسێ و شوێنکەوتووانی بتوانن بیپارێزن لە چەوساندنەوە و گیرو گرفت و ئازاردان ، هەر ئەمەشە بە بۆچوونی من گرنگترین و یەکەمین هۆی ئەو کۆچ کردنە مەزنە .

پێش کەوتنەڕێ بەرەو شاری یەسریب ، تاببێتە بنکەی نوێی بانگەشە ، چەند شوێنێکی تر دەستنیشان کرابوون بۆ کۆچ کردن، جارێك بەرەو وڵاتی حەبەشە کە زۆر لە موسوڵمانە بەراییەکان پێشتر ڕوویان تێکردبوو، ئەو ڕایەش کە دەڵێ کۆچکردنی ئەو کۆمەڵە موسوڵمانە بۆ حەبەشە تەنها لەبەر خۆ ڕزگارکردن بوو لە ستەمی بێ باوەڕان ، هیچ بەڵگەیەکی شیاو و گونجاوی

نیه ، گەر کارەکە وا بووایە دەبوو هەژارترین و بێ دەسەلاتترین کەس لە موسوڵمانان ئەم کۆچەیان بکردایە ، بەلاّم کێشەکە بەتەواوی بەپێچەوانەوە بوو ، ئەوەبوو خزمەتکارە بێ دەسەلاتەکان کە زۆرترین ئەشکەنجە و سزادان و گۆبەندیان بەرامبەر دەکرا ، ئەوانە کۆچیان نەکرد، بەڵکو کەڵە پیاو و خاوەن کەس و کار و پلەو پایەکان بوون، ئەوانەی کە لەو دەروبەرە خێڵەکیەدا پاڵپشتێکی وایان هەبوو کە زۆر بەچاکی دەیانپاراستن لە هەر ئەشکەنجە و ئازاردانێك و، زۆربەی کۆچکردوانیش بریتیبوون لە قورەیشیەکان لە نێوانیاندا جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب ـ کە هەر باوکی ئەوو کورەکانی بەنی هاشم بوون ـ پێغەمبەریان دەپاراست (ﷺ) و هەروا زوبێری کوڕی عەوام ، عەبدولرەحمانی کوڕی عەوف، ئەبوسەلمەی مەخزومی، عوسمانی کوڕی عەفانی ئەمەوی و.... گەلێکی تریش . چەند ژنێکیشیان لەگەڵ بوو کە لە ماڵە خانەدانەکانی مەککە بوون و کەس نەیدەتوانی دەستی ئازاردانیان بۆ درێژ بکات و ستەمیان لێ بکات .. کەواتە لەوانەیە چەند هۆکارێکی دی هەبن بۆ ئەو کۆچکردنە ، وەك بەرپاکردنی هەژاندنێکی بەهێز لەناوەندی ئەو ماڵە خانەدان و گەورانەی هۆزی قورەیشدا ، کە کوڕ و کچە بەرێز و ئازیزەکانیان کۆچ بە عەقیدە و بیرو باوەڕەکەیان دەکەن و لە ترسی ئەو جاهیلیەتە هەڵدێن و پشتیان کردۆتە خزمایەتی و کەس و کاریان بەجێ دێڵن ، لە دەوروبەرێکی خێڵەکی وا کە ئەم کۆچکردنە و بەو شێوەیە زۆر بە توندی دەیهەژێنێ و ڕایدەچڵەکێنێ ، بەتایبەتیش کاتێ لەناو کۆچکردواندا یەکێکی وەکو ( ئومم و حەبیبە )ی کچی ئەبو سوفیانی تیابێ کە سەرداری ئەو جاهیلیەتە بوو وە لە گەورەترین و بەدەسەلاتترین دوژمنان و ناحەزانی دژ بەو بیرو باوەڕو عەقیدە نوێیەو خاوەن عەقیدەکەش بوو.. بەلاّم نمونەی ئەم هۆکارانەش ئەگەری ئەوە بە دوور نازانێ کە لەوانەیە کۆچکردن بۆ وولاتی حەبەشە یەکێك بێت لەو هەوڵە بەردەوامانەی دەدرا بۆ دۆزینەوەی

بنکەیـەکی ئـازاد یـاخود هـەر نـەبێ هـێمن و ئـارام بـۆ بانگـەوازە نوێیەکـە. بەتایبەتیش گەر باسی ئیسلام بوونی سەرۆکی وڵاتی حەبەشە ( نەجاشی ) لـەئارادا بووبێـت . ئـەو ئیـسلام بوونـەی کـە هـیچ لەبـەردەم ئاشـکرا کردنیـدا نەوەسـتابوو تـەنها هەڵـچوون و بەگژاچـوونی پیـاوە ئاینیـەکانی ئـەو وڵاتـە نەبێت!!!. هەروەها وا دەردەکەوێت کە چوونی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ شارۆچکەی ( تائیف ) هەوڵدانێکی دی بێت بۆ دۆزینـەوەی بنکەیـەکی ئازاد یا هـەر نـەبێ هێمن و ئارام بۆ بانگەوازەکە .. بەڵام ئەو هەوڵە سەرکەوتوو نەبوو، چونکە گـەورە پیـاوانی ( سـەقیف ) نابەجێیانـە پێـشوازی پێغەمبـەریان کـرد (ﷺ) هەرچـی منـاڵ و پیـاوە هـیچ و بـێ نرخـەکانیان هـەبوو گاڵیـان دان تـا ئازاری پێغەمبەر بدەن و بەرد بارانی بکەن ، تا هەردوو پێیە نازدارەکەی بریندداربوون و خوێنیـان لێـدەتکا و، وازیـان لێ نـەهێنا تاچـووە نـاو باخـچەی دوو بـرا کـەناویان ( عوتەبـە و شـەیبەی کـوڕی ڕەبیعـە ) بـوو .. هـەر لـەوێ بـەزمانی شـیرین و پـاراوی زۆر بـە دڵـسۆزی و ڕاشـکاوی لـەخوا پاڕایـەوە و ئـەم نـزا بەجۆشەی خوێند: (( اللهم أشكو اليك ضعف قوتي ، وقلة حيلتي و هواني على الناس ، يا أرحم الراحمين أنت رب المستضعفين و انت ربي . الى من تكلني ؟ الى قريب يتجهمني أم الى عدو ملكته أمري . اعوذ بنور وجهك الذي اشرقت له الظلمات ، و صلح عليه أمر الدنيا و الاخرة ، أن تنزل بي غضبك أو تحل علي سخطك . لك العتبى حتى ترضى ، و لاحول و لاقوة الا بك )) .

پاشـان خـوای گـەورە لـە ناکـاو دەرگـای بـەزەیی و بەخشـشی خـۆی لـە پێغەمبـەرو (ﷺ) لـە بانگەوازەکـەش کـردەوە ، ئـەویش بـە پـەیمانی عەقەبـەی یەکـەم و هـەر بەدوایـدا پـەیمانی عەقەبـەی دووەمـیش ، کـە هـەردووکیان پەیوەندیەکی بەهێزیان هەیە بەو بابەتـەی کە لێی دەدوێین لە پێشەکی ئەم سـورەتەدا و، پەیوەندیـشی هەیـە بـەو ئاڵۆزیانـەی پەیـدابوون لـە دەوری بانگەوازەکە لە شاری مەدینەدا .

ئەو بەسەرهاتە بەکورتی بەم شێوەیەیە : پێغەمبەر (ﷺ) دوو ساڵ پێش کۆچکردنی بۆ شاری یە سریب و، لەکاتی حەج کردندا لەگەڵ دەستەیەك لە هۆزی خەزرەج کۆبووەوە لەوکاتەی کە خۆی و بانگەوازەکەی بەو خەڵکە دەناساند کە هاتبوون بۆ حەج کردن و، بۆ کەسانێك دەگەڕا بیپارێزن و بتوانێ بانگەشەکەی خوای مەزن بەو خەڵکە بگەیەنێت . عەرەبەکانی شاری یە سریب ــ هۆزی ئەوس و خەزرەج ــ زۆرجار لە جوەکانی ئەو شارەیان دەبیست کە هاتنی پێغەمبەرێك کاتی هاتووە و نزیکی سەرهەڵدانێتی ، چاویشیان لەوەبووە کە لەسەر دەستی ئەو پێغەمبەرەدا دەسەڵات پەیدا بکەن و بەسەر دوژمنەکانیاندا زاڵ ببن ، ئیتر کەنوێنەرانی خەزرەج بانگەوازەکەی پێغەمبەریان بیست . بەیەکتریان ئەووت : وا دیارە ئەمە ئەو پێغەمبەرەیە کە جولەکەکان لەمێژە باسیدەکەن، دەسا با زوو ئێمە دەست پێشکەری بکەین و باوەڕی پێ بێنین، ئەوەبوو باوەڕیان هێناو پێ یان ووت: ئێمە میللەتێکین کەس هێشتا وەکو ئێمە گیرۆدەی دوژمنایەتیەکی ناوخۆی وا ئاڵۆز و سەخت نەبۆتەوە بەڵکو لەسەر دەستی تۆدا خوای گەورە ڕێکمانبخات و یەکبگرینەوە.. کە گەڕانەوە بۆناو خێڵ و هۆزیان ، ئەم کێشەیان بۆ باسکردن ، ئەوانیش زۆریان بەدڵ بوو ، ڕەزامەندی خۆشیان بۆ ئەم کارەیان پیشاندا ..

ساڵی دواتر دەستەیەك لە ئەوس و خەزرەج هاتن بۆ حەجکردن، ئەمانیش بەخزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتن و پەیمانی ئیسلامبوونیان لەگەڵ بەست و ئەویش چەند کەسێکی لەگەڵ ناردن تا بنەماکانی ئیسلامیان بەچاکی فێر بکەن ..

بۆ وەرزی داهاتوو کۆمەڵێکی گەورەتر لە ئەوس و خەزرەج هاتنەوە بۆلای پێغەمبەرو(ﷺ) داوای پەیمان بەستنیان کرد ، ئیتر بە ئامادەبوونی عەباسی مامی پێغەمبەر (ﷺ) پەیمانیان لێوەرگیرا بەمەرجی ئەوەی چی بۆ خۆیان و سامان و داراییان پێ خۆشە و یا پێ ناخۆشە بۆ پێغەمبەریش پێیان خۆش

بێ و بیپارێزن ، ئەم پەیمانەی دووەم بە (پەیمانی عەقەبەی گەورە) ناسرا .
وە دەربارەی ئەو بەسەرهاتە ( موحەممەدی کوڕی قورەزی ) دەگێڕێتەوە :
قال عبدالله بن رواحة (ﷺ) لرسول الله (ﷺ) يعني ليلة العقبة : إشترط لربك و لنفسك ماشئت : فقال : (( اشترط لربي أن تعبدوه و لاترشركوا به شيئا، و اشترط لنفسي ان تمنعوني مما تمنعون من انفسكم و اموالكم )) قال : فما لنا اذا فعلنا ذلك ؟ قال : (( الجنة )) قالوا : ربح البيع و لانقيل و لانستقبل !

ئا بەو شێوە توندو بەهێزە باوەشیان کرد بەو ئەرك و فرمانەدا .. بۆیە هەر پاش ئەوە ئیسلام لەشاری مەدینەدا بڵاوبۆوە و تا وای لێهات ماڵێك نەبوو ئیسلامی وەر نەگرتبێ و باوەڕی پێ نەهێنابێ ، موسوڵمانانی شاری مەککەش وردە وردە و یەك لەدوای یەك دەستیان کرد بە کۆچکردن بۆ مەدینە و ، هەموو شتێکیان لەدوای خۆیانەوە بەجێ هێشت ، تەنها نیازیان ڕزگارکردنی عەقیدەکەیان بوو ، وە لەلایەن ئەو برا موسوڵمانانەی کە لەسەر ماڵ و سامانی خۆیان بوون لەشاری مەدینە پێشوازیەکی بێ ئەندازە و گەرم و گوڕیان لێکرا کە سەبارەت برایەتی و تەبایی و بەخشینی ماڵ و سامان بەدرێژایی ژیانی مرۆڤایەتی نمونەی وا نەبینراوەو باسنەکراوە. دوای ئەمانیش پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ برادەرە دڵسۆزەکەیدا ـ أبوبکری صدیق ـ (ﷺ) کۆچیان کرد. کۆچیان کرد بۆ ئەو بنکە و بارەگا ئازادە بەهێز و هێمن و ئارامەی کە لەوەو پێش زۆر بەدوایدا دەگەڕان .. ئیتر هەر لەیەکەم ڕۆژی گەیشتنی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئەو شارە دەوڵەتی ئیسلامی دەمەزراو دەست بەکار بوو ..

لەو خەڵکە موسوڵمانەی کە هەرزوو کۆچیان کردو لە لایەنگرانیشیان دەستەیەکی باڵای زۆر پەسەندی ڕێك و پێك دروست بوو کە لە زۆر جێگادا قورئان ئاماژەیان بۆدەکات . لەم سورەتەشدا دەبینین هەر لەسەرەتاوە دەستنیشانی بنەماکانی بیروباوەڕو ئیمان دەکات کە نیشانەیەکی ڕەهای

سیفەتی موسوڵمانە ڕاستگۆکانە ، بەڵام لەسەرەتادا باس لەو موسوڵمانانە دەکات کە لەمەدینەدا دروست بووبوون و باوەڕیان هێنابوو (( الم . ذلك الكتاب لاريب فيه هدى للمتقين ، الذين يؤمنون بالغيب و يقيمون الصلاة ومما رزقناهم ينفقون ، والذين يؤمنون بما انزل اليك وما انزل من قبلك وبالاخرة هم يوقنون اولئك على هدى من ربهم واولئك هم المفلحون )) .

پاشان ڕاستەوخۆ لە ڕەوتەکەدا دەبینین باس لە بێ باوەڕان دەکات – کە بنەما ڕەهاکانی کوفرو بێ باوەڕی نمایش– دەکات، بەڵام یەکەم جار باسی ئەو بێ باوەڕانە دەکات کە بانگەوازەکە بەرەو ڕوویان دەبوەوەو، چ لەو کاتەی کە لەشاری مەککەدا بوون یاخود ئەو هۆزە بێ باوەڕانەی کە لە دەوروبەری شاری مەدینەدا بوون (( ان الذين كفروا سواء عليهم أانذرتهم ام لم تنذرهم لا يؤمنون. ختم الله على قلوبهم وعلى سمعهم و على ابصارهم غشاوة و لهم عذاب عظيم )) .

هەروەها دەستەو تاقمی دووڕوانیش هەبوون. بوونی ئەم کۆمەڵەیەش لەگەڵ ئەو بارودۆخ و کەش و هەوایەدا سەری هەڵدا کە کۆچکردنەکەی پێغەمبەری سەپاند بۆشاری مەدینە کە لەوەو پێش ئاماژەمان بۆکردن ، بەڵام لەشاری مەککە ئەم دەستەیە دروست نەبوو بوو چونکە ئیسلام لەوێ نەدەوڵەت و نەهێزی هەبوو بەڵکو کۆمەڵێکی واش نەبوون کە خەڵکی مەککە لێیان بترسن و ڕووپامایان بۆبکەن . بگرە بە پێچەوانەشەوە ئیسلام چەوساوەو لانەوازو بانگەوازەکەشی هەنگاو بە هەنگاو لێدەدراو ڕاودەنرا، ئەوانەشی کە زۆر بەجەرگ و چاو نەترس بوون و هاتنە ڕیزی موسوڵمانانەوە مرۆڤە دڵسۆز و لەخۆبردووەکان بوون، ئەوانەی کە ئەم عەقیدە نوێیەیان لە هەموو شتێك لا ئازیزترو شیرین تربوو، وە لە پێناویدا دەست بەرداری هەموو شتێك دەبوون ، بەڵام لەشاری یەسریب کە لە یەکەم ڕۆژی کۆچکردنەوە بەشاری مەدینە ناودەبرا – یان شارەکەی پێغەمبەر– لەوێ

ئیسلام بوو بەو هێزەی کە ڕەچاو بکرێ و بەچاوێکی ترەوە سەیربکرێت و زۆر یا کەم دەبووایە حسابی بۆبکرێت ـ بەتایبەتیش پاش جەنگی بەدرو ئەو سەرکەوتنە گەورەیەی موسوڵمانان بەدەستیان هێنا ـ لەسەروو ئەوانەوەی کە ڕووپامابیان دەکرد چەند کەسانێك بوون لە گەورە پیاوان، ئەوانەی کە کەسو کاریان موسوڵمان بوون و ئەبوایە ئەمانیش بپارێزن ، ئەبوایە بەڕواڵەت وایان دەربخستایە کە ئەمانیش باوەڕیان بەم ئاینە نوێیە هێناوە کە کەسو کاریان پێی ڕازین و دوای کەوتوون ، لەو گەورە پیاوانەش عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول بوو، ئەو کابرایەی پێش ئەوەی ئیسلام بگاتە شاری مەدینە بەماوەیك هۆزەکەی خەریکی هۆنینەوەی ملوانکەی پاشایەتی بوون بۆی تا بیکەن بەسەردارو سەرۆکی خۆیان .

لەسەرەتای ئەم سورەتەدا باسێکی تێرو تەسەلی ئەم ڕووداوانە دەبینین ، لەهەندێ برگەیدا وادەردەکەوێ مەبەست لەو گەورە پیاوانەیە کە وایان لێهاتبوو بە ڕواڵەت ئیسلام بن و هێشتا لوت بەرزی خۆیان لەبیر نەچووبۆوە لەناو خەڵکیدا و، ئەو جەماوەرەیان بەهیچ و کەم عەقڵ دادەنا ، ئەم ڕەوشتەش هەردەم سیمای گەورەپیاوە لوت بەرزەکان دەنوێنێ ! (( ومن الناس من يقول امنا بالله و باليوم الاخر وماهم بمؤمنين . يخادعون الله و الذين امنوا، وما يخدعون الا انفسهم وما يشعرون . في قلوبهم مرض فزادهم الله مرضا، ولهم عذاب اليم بماكانوا يكذبون. واذا قيل لهم امنوا كما امن الناس قالوا : انؤمن كما امن السفهاء؟ الا انهم هم السفهاء ولكنهم لايعلمون . واذا لقوا الذين امنوا قالوا : امنا، واذا خلوا الى شياطينهم قالوا : إنا معكم انما نحن مستهزئون . الله يستهزئ بهم ويمدهم في طغيانهم يعمهون . أولئك الذين اشتروا الضلالة بالهدى .... الى ... ولو شاء الله لذهب بسمعهم و ابصارهم ، إن الله على كل شئ قدير )) ..

لەپەنا ئەم هێرشە بۆسەر ـ دووڕوان ـ ئەوانەی دڵیان نەخۆش و کرمێیە، ئاماژەیەك بۆ سەرانیان تێبینی دەکرێت کە بە ((شیاطینهم )) ناویان دەبات و لەڕەوتی سورەتەکە و ڕەوتی ڕووداوەکانیشدا وادەردەکەوێت کە مەبەست لە جوەکانە، ئەوانەی لە دووتوێی ئەم سورەتەدا زۆر بەتوندی هێرشیان کراوەتەسەر . کە بەسەرهاتیان لەگەڵ بانگەشەکەدا لەم چەند دێڕەی خوارەوەدا کورت دەکەینەوە .

جولەکە یەکەمین کەسانێك بوون کەلە شاری مەدینە بەرەنگاری بانگەوازەکە بوونەوە ، کەئەوەش هۆکاری خۆی هەبوو.. ئەم جولەکانە لە یەسریب پلەو پایەیەکی باشیان هەبوو لەناو ئەو عەرەبە نەخوێندەوارانەدا ـ ئەوس و خەزرەج ـ چونکە ئەمان خاوەن پەڕتوکی ئاسمانی بوون ، وە لەگەڵ ئەوەشدا کە هاوبەش پەیداکارانی ئەوێ ئارەزوو و نیازی ئەوەیان نەبوو بچنە ناو ئاینی خاوەن پەڕتووکەکانەوە بەڵام زۆر لەخۆیان بەزاناترو داناتریان دەزانین لەبەرئەوەی خاوەن پەڕتوکی ئاسمانین ، هەروەها ئەو بارە ئاڵۆزو ئەو دووبەرەکیەی لەناو ئەوس و خەزرەجدا هەبوو زەمینەیەکی لەبارو گونجاوبوو بۆ ئەم جولەکانە کە پیلانە گڵاوەکانی خۆیانی تێدا ئەنجام بدەن ـ ئەوەش ئەو بارودۆخانەیە کە جولەکە هەردەم بەدوایدا دەگەڕێن ودەیقۆزنەوەوئیشی خۆیانی تیادەکەن ـــ بەڵام کاتێك ئیسلام هات ئەو هەموو هەل وبەرژەوەندیانەیان لەدەستدا .. چونکە پەڕتوکێکی وای هێنا کە باوەڕی پتەوی بەسەرجەم پەڕتووکەکانی پێش خۆی هەبوو لەوانیش پتەوترو پڕترو سەرکەوتووتریش بوو ، هەروەها ئەو دووبەرەکیەی بن بڕ کرد کە جوەکان بەهەلیان دەزانی بۆ ئەنجامدانی نەخشەو پلان و سوودە تایبەتیەکانیان ، هەروەها ڕیزی هەموو موسوڵمانانی یەکخست بە ئەوس و خەزرەجیشەوە، هەر لەیەکەم ڕۆژیشەوە پێیان دەوترا لایەنگران ، بۆ کۆچکردوان، لەکۆی هەمووشیان ئەو کۆمەڵگا موسوڵمانەی پێکهێنا کە ئەوەندە پتەو و داڕێژراو

بوو مرۆڤـایەتی نە لەوەوپێش و نەلەوەودواش هەرگیز نمونەو هاوشێوەی تیا دروست نەبووە و بەخۆیەوە نەدیوەو نایبینێتەوە .

جوەکان خۆیـان بەگەلی هەڵبـژێردراوی خوا دەزانی و، دەیانگوت پەیام و پەرتووکیش هەر لەناوئەواندا هەیە، بۆیە هەردەم چاویان لەوەبوو دوایـن پێغەمبەریش هەر لەوان بێت، وە کاتێ ئەو پێغەمبەرە لەناو عەرەبدا هەڵکەوت وایـان دانـابوو کـە ئـەمان لـەدەرەوەی بازنـەی بانگەوازەکـەی خـۆی دابنـێ و، تەنها بانگەشـەی ئـەو عەرەبە نەخوێندەوارانە بکات ! بەڵام کە بینیـان ئـەوان یەکەمین کەسن بانگیان دەکات بۆ باوەڕهێنان بەو پەرتووکە پیرۆزەی خـوای گەورە، بەگوێرەی ئەوەی کە ئەمان زاناترن لەو هاوبەش پەیداکارانە و هـەر ئەبێ ئەمان زووتر وەڵامی بدەنەوە و بەدەنگیەوە بێن .. ئەمە وایلێکردن لووت بەرزو خۆبەشت بزانن و ئەو بانگهێشتەشیان بەکەم کردنـەوە لەنرخ و پلـەو پایەی خۆیان دادەنا!

هـــەروەها حەســـودیەکی زۆریـــان بـــە پێغەمبـــەر دەبـــرد(ﷺ)، ئـــەو حەسودیەشیـان بـەدوو شـێوە ڕەنگـی دابۆوە ، یەکـەمیان لەبەرئـەوەی خـوای مـەزن ئەوی بە پێغەمبـەر هەڵبـژاردووە و پـەرتوکی بـۆ ناردۆتـە خـوارێ ــ کە ئەمانیش خۆیان گومانیان لەو ڕاستیە نەبووـ هەروەها حەسوودیان پێ ئەبرد بۆ ئەو سەرکەوتنە خێراو گشتیەی بەدەستی هێنا لەوماوە کەمەدا لەشاری مەدینـەو دەوروبەریشیدا. بـەڵام هۆیـەکی تـریش هـەبوو بـۆ ئـەو هـەموو ڕق و کینەی هەیانبوو بەرامبەر ئیسلام و ئەو هەڵوێستە دوژمنکاریەی هەر لەیەکەم ڕۆژەوە پێیانەوە دیاربوو : ئەویش ئەوەبوو هەستیان بە مەترسی گۆشەگیری خۆیـان دەکـرد لـە کۆمـەڵگای مەدینـەدا ، ئـەو کۆمەڵگایـەی کـە بـە ئـارەزووی خۆیــان ســەروەریی بـیروڕاو، بازرگــانیی فــرە قــازانج و ســوو خۆریــان بــە بەردەوامی تیا دەکرد ! جا ئاوا بژین و هەروا بمێننـەوە یاخود بەدەنگ ئەم

بانگەوازە نوێیەوە بچن و لەناو ئەوکۆمەڵگا ئیسلامیە نوێیەدا بتوێنەوە !
ئەمانە کارێك بوون ـ لەدیدی ئەواندا ـ یەك لەیەك خراپتر بوون!

هەر لەبەر ئەم هەموو هۆیانەبوو جوەکان ئەم هەڵوێستە تایبەتیەیان هەبوو بەرامبەر بانگەشەی ئیسلامی، ئەو هەڵوێستەی کە سورەتی بەقەرە زۆر بە دوورو درێژی باسی لێ دەکات (هەروەها لە زۆر سورەتی تریشدا باس دەکرێت) ، لێرەدا چەند ئایەتێك دەخەینەروو کە ئاماژەی بۆ دەکەن : لەسەرەتای باسکردنی بەنی ئیسرائیلدا ئەم بانگەوازە بالآیە دەبینین: ﴿ يا بني إسرائيل اذكروا نعمتي التي انعمت عليكم و اوفوا بعهدي أوف بعهدكم و إياي فارهبون ، وامنوا بما انزلت مصدقا لما معكم ، ولاتكونوا أول كافربه ، ولاتشتروا باياتي ثمنا قليلاً ، وإياي فاتقون . ولاتلبسوا الحق بالباطل وتكتموا الحق وأنتم تعلمون. وأقيموا الصلاة واتوا الزكاة واركعوا مع الراكعين . اتأمرون الناس بالبر وتنسون انفسكم ؟ وانتم تتلون الكتاب ؟ افلا تعقلون ؟﴾ پاش بیرخستنەوەی ئەو هەڵوێستانەیان بەرامبەر پێغەمبەرەکەیان ــ حەزرەتی موسی (سەلامی خوای لێ بیت) ــ وە نکوڵیان لەو نازو نیعمەتە زۆرانەی خوای گەورە و، لادان و پشتکردنە پەرتووك و بەرنامە و شەریعەتەکەیان و... ئەو پەیمان شکاندنەی لەگەڵ خوای مەزندا کردیان .. هەر لەو رەوتەوە رووودەکاتە موسوڵمانان تا وریابن و ئاگایان لەخۆیان بێت و لە پارێزابن بەرامبەر ئەو جوانە : ﴿ افتطمعون ان يؤمنوا لكم وقد كان فريق منهم يسمعون كلام الله ثم يحرفونه من بعد ماعقلوه وهم يعلمون ؟ واذا لقوا الذين امنوا قالو: امنا، واذا خلا بعضهم الى بعض قالوا : اتحدثونهم بما فتح الله عليكم ليحاجوكم به عند ربكم، افلا تعقلون ؟﴾ ..﴿ وقالوا لن تمسنا النار الا أياما معدودة: قل: اتخذتم عندالله عهدا فلن يخلف الله عهده؟ أم تقولون على الله ما لاتعلمون ﴾ ..﴿ ولما جاءهم كتاب من عند الله مصدق لما معهم وكانوا من قبل يستفتحون على الذين كفروا لما جاءهم ما عرفوا فكفروا به فلعنة الله

على الكافرين ﴾ ..﴿ واذا قيل لهم امنوا بما انزل الله: قالوا: نؤمن بما انزل الينا، ويكفرون بما وراءه، وهو الحق مصدقا لما معهم ﴾..﴿ولما جاءهم رسول من عند الله مصدقا لما معهم نبذ فريق من الذين اوتوا الكتاب كتاب الله وراء ظهورهم كأنهم لايعلمون ﴾..﴿ مايود الذين كفروا من اهل الكتاب ولاالمشركين ان ينزل عليكم من خير من ربكم ﴾.. ﴿ ود كثير من اهل الكتاب لو يردونكم من بعد ايمانكم كفارا حسدا من عند انفسهم من بعد ما تبين لهم الحق﴾.. ﴿ وقالوا: لن يدخل الجنة الا من كان هودا او نصارى. تلك امانيهم ﴾ ..﴿ ولن ترضى عنك اليهود ولا النصارى حتى تتبع ملتهم ﴾ ...هتد هتد

موعجيزەی هەمیشە زیندووی قورئانیش ئەوەبوو کە ئەو سیفەتانەی کە باسیان دەکاو بووە بە مۆرێك بە ناوچەوانیانەوە سیفەتێکن لێیان نابێتەوەو بەردەوام هەر وابوون ، بەدرێژایی مێژوویان و لەگشت نەوەکانیاندا و، پێش ئیسلام و تا ڕۆژگاری ئەمرۆشمان هەروا ماونەتەوە . ئەوەش وای لە قورئان کرد ـ لەکاتی پێغەمبەردا (ﷺ) ـ بەشێوەیەك لەگەڵیان بدوێ کە ئەڵێی هەر هەمان ئەو خەڵکەن کە لەسەردەمی موسادابوون ـ سەلامی خوای لێبێت ـ یا لەسەردەمی پێغەمبەرەکانی پاش ئەویشدابوون . چونکە یەك سرووشت و هەمان ڕەوشت و هەمان ڕۆڵیان هەیەو ناگۆڕێن ، هەڵوێستیشیان بەرامبەر هەق و ڕاستی و بوونەوەران بەدرێژایی مێژوویان هەمان هەڵوێستە !

دیسان لەڕەوتی ئایەتەکاندا ، کاتێ لەنەتەوەی موسا دەدوێ ، زۆر لادەکاتەوە بەلای جولەکەکانی شاری مەدینە و ئەوانەش کە لەنێوانیاندا هاتبوون و ، وتەکانی قورئان هەروا بەزیندوێتی دەمێننەوە چونکە ئەڵێی ڕووبەڕووی هەمان هەڵوێستی نەتەوەی موسوڵمانی ئەمڕۆ دەبێتەوە کە لەلایەن جوەکانەوە بەرامبەریان دەکرێتەوە . باسی پێشوازی جوەکان دەکات لەم عەقیدەیەو لەم بانگەوازە، لەمڕۆ و لە سبەینێشدا ، هەروەك چۆن دوێنێش

بەهەمان شێواز پێشوازیان لێکرد! وا دەردەکەوێ کە ئەو وتە بەنرخ و زیندووانە هۆشیارکردنەوەی بەردەوام و ئاگادارکردنەوەی بەهێزیش بن بۆ نەتەوەی موسوڵمان ، بەرامبەر دوژمنانی ئەمڕۆیان کە بەهەمان کەرەستە و هەمان شێواز لەپیلانگێڕان و فێڵ و تەڵەکەبازی و هێرش و جەنگی فرەچەشنە هەر بۆیەك مەبەست و یەك ئامانجە ، کە لەوەوپێشیش بەرەو ڕووی باو و باپیرانیان بووبوونەوە !

ئەم سورەتە کە ئەم هەموو باسکردن و ئاگادارکردنەوەو هۆشیارکردنەوەیەی تیابوو، هەروەها باسی ئامادەباشی کۆمەڵی موسوڵمانیش دەکاو چۆن ئامادەبێت بۆ هەڵگرتنی ئەرکی عەقیدەو بیروباوەڕ لەسەر زەوی پاش ئەوەی کاتی خۆی بەنی ئیسرائیل ئەو ئەرکەیان لەسەر شانی خۆیان لاداو پشتیان تێ کرد و، چۆن لەم دواییەشدا ئەم هەڵوێستە نەگریسەیان هەبوو بەرامبەر ئەو کۆمەڵگایە ..

سورەتەکە ــ وەك باسمان کرد ــ سەرەتا باسی ئەو کۆمەڵ و گروپانە دەکات کە هەرزوو پاش کۆچکردن بەرەنگاری بانگەشەکە بوونەوە لەگەڵ ئەوەشدا ئاماژە کردنی بۆ شەیتانە جوەکان تێدایە ، ئەوانەی کە لەمەوپاش بەدووروودرێژی باسیان لێدەکرێ وە دوای ئەوە ڕایدەگەیەنێ هەرهەمان ئەو کۆمەڵانەن کە بەدرێژایی مێژوو بەرەنگاری ئەم بانگەوازە دەبنەوە .

دیسانەوە سورەتەکە لەسەر ڕەوتە جوت هێڵیەکەی خۆی بەردەوام دەبێ و تا دەگاتە کۆتایی، لەبەرگێکی یەککگرتووی دیاردا کە نمایشی کەسایەتیەکی تایبەتی سورەتەکە دەکات ، لەگەڵ ئەوەی کە چەندین بابەتی هەمەچەشنەشی لەخۆگرتووە .

ئەوەتا هەرپاش پێشاندانی هەرسێ نموونە بەراییەکان : موسوڵمانانی لەخواترس و، بێباوەڕان و ، دووڕووان . وە دوای ئاماژە کردنێکی شاراوە بۆ جوە شەیتانەکان .. دەبینین سەرجەم مرۆڤایەتی بانگ دەکات تا خوای

گەورە بپەرستن و باوەڕ بەو پەرتووکە بێنن کە هاتەخواریٚ بۆ ئەو بەندەیەی خواو، بەرەنگاری گومان لەدڵانیش دەبێتەوە کە گەر دەتوانن با لەوێنەی ئەو قورئانە سورەتێك بێننەوە و، بێباوەڕانیش دەترسێنێت بەئاگری دۆزەخ و مژدە دەدات بەباوەڕداران بەخۆشی و نازو بەهرەکانی ناو بەهەشت .. پاشانیش دەبینین چۆن بەسەرسوڕمانەوە دەڕوانێتە ئەوانەی باوەڕیان بەخوا نیە ﴿ کیف تکفرون بالله وکنتم امواتا فأحیاکم ، ثم یمیتکم ثم یحییکم، ثم الیه ترجعون ! هو الذي خلق لکم مافي الارض جمیعا ثم استوی الی السماء فسواهن سبع سموات ، وهو بکل شيء علیم ﴾ ..

ئالەم بڕگەیەدا کە ئاماژە بۆ بەدیهێنانی ئەو هەموو شتانەی سەرزەوی دەکات بۆ مرۆڤ ، دەبینین باس لە چۆنیەتی جێنشینی ئادەم دەکات لەسەر زەوی ﴿ واذ قال ربك للملائکة انـي جاعل في الأرض خلیفة ﴾ .. ئینجا بەسەرهاتەکە باس لەو جەنگە بەردەوامەی نێوان ئادەم و شەیتان دەکات تا کۆتایی پێ دێت بەپیادەبوونی پەیمانی جێنشینی ـ کە پەیمانی ئیمان و باوەڕهێنانە ـ : ﴿ قلنا: إهبطوا منها جمیعا فأما یأتینکم مني هدی، فمن تبع هداي فلاخوف علیهم ولاهم یحزنون والذین کفروا وکذبوا بایاتنا اولئك اصحاب النار هم فیها خالدون ﴾ .

دوای ئەوە دەست بە باسکردنێکی بەرفراوان دەکات لەگەڵ بەنی ئیسرائیلدا ـ کە لەمەوپێش ئاماژەمان بۆ هەندێکیان کرد ـ ناوبەناویش بانگەوازیان دەکات بۆ هاتنە ژێربالّی ئاینی خوا کە باوەڕ بە ئاینەکەی ئەوانیش دێنێ لەگەڵ بیرخستنەوەی ئەو هەڵەموت و بەهەڵەداچوون و لادان و تێکەڵ کردنانەی کە هەر لە ڕۆژانی موساوە ـ سەلامی خوای لیٚ بێت ـ دەیان کرد و پیشەیان بوو ، ئەم باسکردنەش زۆربەی زۆری بەشی یەکەمی ئەم سورەتە دەگرێتەوە .

هەر لەم باسکردنەدا وێنەیەکی ڕوون و ئاشکرا دەکێشرێ دەربارەی ئەو پێشوازیەی بەنی ئیسرائیل کردیان بۆ پێغەمبەر و پەرتوکەکەی خوای مەزن کە یەکەمین کەس بوون باوەڕیان پێی نەبوو جگە لەوەی دروست و نادروستیان تێکەڵاو دەکردو، خەڵکیان هاندەدا و فەرمانیشیان پێ دەکردن بۆ چاکە و چاکە خوازی ـ کەبریتی بوو لە ئیمان و باوەڕ هێنان ـ بەڵام خودی خۆیانیان لەبیردەکرد ، دوای ئەوەی گوێ بیستی وتەکانی خوای گەورە دەبوون و باش تێی دەگەیشتن، تێکیان دەدا و ماناکانیان دەگۆڕی ، وە هەوڵیان ئەدا باوەڕداران هەڵبخەڵەتێنن بەفێڵی ئاشکراکردنی باوەڕهێنانی خۆیان ، بەڵام گەر بەتەنیا و هەر خۆیان بوونایە یەکتریان لەوە ئاگادار دەکردەوە کە نابێ موسوڵمانەکان ئەو ڕاستیانە بزانن کە ئەمان دەیانزانی سەبارەت بە پێغەمبەرو ڕاستی و دروستی پەیامە پیرۆزەکەی ! دەیان ویست موسوڵمانەکان پاشگەز بکەنەوە و باوەڕەکەیان پێ بدۆڕێنن ، بۆ ئەم مەبەستەش ئەیان وت کە بەتەنها هەر جولەکەکان ڕێی ڕاست ئەزانن و باوەڕدارن ــ هەروەك چۆن گاورەکانیش وایان دەوت ــ وە دوژمنایەتی خۆشیان دەردەخست بۆ جوبرائیل ــ سەلامی خوای لێبێت ــ لەبەرئەوەی سرووشی پیرۆزی بۆ محمد بردو بۆ ئەمانی نەهێنا! وە هیچ چاکەو خۆشیەکیان بۆ موسوڵمانەکان نەدەویست و چاوەڕێی هەر هەلێکیان دەکرد تا زیانیان پێ بگەیەنن و لە هەلێکیش دەگەڕان کە گومان بخەنە نێو فەرمایشتە دروست و بەجێکانی پێغەمبەرو (ﷺ) گومان بخەنە ڕاستیی ناردنی لەلایەن خوای مەزنەوە ــ وەك ئەوەی کردیان دەربارەی قیبلە ــ هەروەها هەروەك چۆن سەرچاوەی هاندان و ئاڕاستە کردنی دووڕووان بوون ، سەرچاوەی هاندانی هاوبەش پەیداکەرانیش بوون ..

پاشان سورەتەکە هێرشێکی توندوتیژ دەکاتە سەر ئەم ڕەفتارەیان و ، ئەو هەڵوێستانەشیان بیردەخاتەوە کە وەریانگرتبوو بەرامبەر موسای

پێغەمبەریان ـ سەلامی خوای لێبێت ـ هەروەها هەڵوێستیان بەرامبەر بەرنامە و پێغەمبەرانی تریشیان بەدرێژایی نەوەکانیان ، وا لەگەڵیشیان دەدوێ کە ئەڵێی هەمان نەوەن و نەگۆڕاون و یەك سروشتن و ناگۆڕێن و چاکتر نابن .

ئەم هێرشە بەوە کۆتایی دێت کە موسوڵمانان تێدەگەیەنێت چیتر بەئاواتی ئەوەوە نەبن ئەوانە باوەڕبێنن گەر لەسەر هەمان سروشت و لادان و پێچ و پەناو فروفێڵانەیان بمێننەوە . هەروەها کۆتایشی بەوە دێت کە ئەو پڕوپاگەندەیەیان پوچەڵ دەکاتەوە کە گوایە هەر ئەمان ڕێنمایی وەردەگرن و بەوەی کە میراتگری ئیبراهیمن ، وە ڕوونیشی دەکاتەوە کە جێگرانی ڕاستەقینەی ئیبراهیم ئەو کەسانەن کە لەسەر بیرو باوەڕو ڕەوشتی ئەو دەڕۆن و پابەندی ئەو پەیمانەن کەئەو بەستی لەگەڵ خوای خۆیدا ، کەواتە جێگرێتی دروستی ئیبراهیم درایە دەست موحەممەد و (ﷺ) ئەوانەی کە بڕوایان پێ هێنا، پاش ئەوەی جوەکان لایاندا و پاشگەز بوونەوە و نکوڵیان کرد لە هەڵگرتنی ئەو ئەمانەت و ئەو ئەرکە پیرۆزە و لە جێنشینی سەر زەوی بەپێی یاساو بەرنامەی خوای تاك و تەنها، بەڵام موحەممەد و هاوڕێیانی چوونە ژێر باری ئەو ئەرکە پیرۆز و مەزنەوە، ئەمەش هاتنەدی ئەو نزاو پاڕانەوە بوو کە ئیبراهیم و ئیسماعیل ـ سەلامی خوایان لێبێت ـ دەیانکرد کاتێ کە بناغەو پایەکانی ماڵی خوایان بەرزدەکردەوەو دادەمەزراند: ﴿ ربنا وآجعلنا مسلمين لك ومن ذريتنا امة مسلمة لك . وارنا مناسكنا، وتب علينا، انك انت التواب الرحيم ﴾ ..

ئالەم سنورەوە سورەتەکە ڕوودەکاتە پێغەمبەرو (ﷺ) ئەو کۆمەڵە موسوڵمانەی لەدەوری بوون ، دەست دەکات بە دامەزراندنی ئەو بناغەو پایانەی کە ژیانی ئەو کۆمەڵەیەی لەسەر هەڵدەستێ و جیاکردنەوەی ئەم کۆمەڵەیە بەچەند مۆرکێکی تایبەتی و بەبەرنامەو بۆچوونی تایبەت بۆ ژیان ،

ئەو كۆمەڵەیەی كە ئەركی بانگەشەی خواناسینی پێ سپێردراوە لەسەر ئەم زەویە .

هەر بەو مەبەستەش بەدیاریكردنی قیبلە دەست پێ دەكات، كە ئەبێ ئەم كۆمەڵەیە رووی تێبكات و ببێتە رووگەی نوێیان، ئەویش ئەو ماڵە پارێزراوەیەی خوای گەورەیە كە كاری دروست كردن و پاككردنەوەی درایە دەست ئیبراهیم و ئیسماعیل تا بەتەنها خوای تیا بپەرستێت ، ئەو رووگەیەی كە پێغەمبەر (ﷺ) ئارەزووی رووتێكردنی هەبوو بەڵام دەری نەدەبڕی : ﴿ قد نری تقلب وجهك في السماء فلنولينك قبلة ترضاها، فول وجهك شطر المسجد الحرام ، وحيثما كنتم فولوا وجوهكم شطره ﴾ ..

پاشان سورەتەكە باس لەبەرنامە و یاسای خوا دەكات بۆ ئەم كۆمەڵە ، بەرنامەی بۆچوون و پەرستن ، بەرنامەی رەوشت و رەفتارو مامەڵەكردن ، ئەوەیان بۆ باس دەكا كە ئەوانەی لەپێناوی خوادا دەكوژرێن بەمردوو دانانرێن و هەمیشە زیندوون ، وە ترس و برسێتی و سامان لەدەست دان و نەمانی بەروبووم ، ئەم دیاردانە بریتی نین لە خراپەو شەڕێك كە دێتە ڕێیان ، بەڵكو شێوەیەكە لە تاقیكردنەوە و ، ئاكامی ئارام گرانیش لەسەر ئەم گرفتانە بەدەست هێنانی بەزەیی و بەخشندەیی و ڕێنمایی خوای گەورەو باڵادەستە، وە شەیتان بەڵێنی هەژاری دەدات بەخەڵكی و فەرمان بەخراپە و بەدكاریان پێدەكا. بەڵام خوای مەزن مژدەی لێخۆشبوون و بەخشێنكی فراوانیان دەداتێ، هەر خوای گەورە سەرپەرشكاری باوەڕدارانە و لەتاریكی دەیانگوێزێتەوە بەرەو روناكی، بەڵام ئەوانەی بێباوەڕن لایەنگیرو سەرپەرشتیاریان مل هوڕو بێباوەڕەكانن كە لەروناكیەوە دەیانگوێزنەوە تاریكستان .. هەروەها بابەتەكانی حەڵاڵ و حەرام و شیاو و نەشیاو لە خواردن و خواردنەوەی بۆ دیاری كردوون، وە ناوەرۆك و كرۆكی چاكەكردنیش، نەك رووكەش و رواڵەتی ، بۆ دەست نیشان كردن. هەروەها

یاساکانی کێشەی تۆڵە سەندنەوەی پاش کوشتن دیاری دەکا و، فەرمانەکانی وەسیەت کردن و ڕۆژوو گرتن و، حەج و ژنهێنان و جیابوونەوە و، درێژەدان بەباسی یاساکانی خێزان بەتایبەتی و کێشەکانی سوو خۆری و قەرزکردن و بازرگانیش ....

لەگەڵ بۆنەو بواری تایبەتیشدا باسەکە دەگەڕێتەوە سەر بەنی ئیسرائیل لەدوای موسا پێغەمبەر ـ سەلامی خوای لێبێت ـ وە چەند زنجیرەیەکیش لەبەسەرهاتی ئیبراهیم باس دەکات. بەڵام جەستەی سورەتەکە ـ دوای بەشی یەکەمینی ـ پەروەدەکاتە بنیات نانی کۆمەڵگای موسوڵمان و ، ئامادەکردنیان بۆ هەڵگرتنی ئەرکی عەقیدە و بیرو باوەڕو ، جێنشینی لەسەر زەوی بەپێی بەرنامە و یاساو شەریعەتی خوای گەورە و جیاکردنەوەیان بەو بۆچوونە تایبەتیەی هەیەتی بۆ بوونەوەرو پەیوەندیەکانی بەو پەروەردگارەی کە هەڵیبژاردوە بۆ چوونە ژێرباری ئەم ڕاسپاردە گەورەو مەزن و پیرۆزەوە .

لەکۆتاییدا دەبینین سورەتەکە لادەکاتەوە بەلای سەرەتاکەیداو دەستنیشانی سروشتی بۆچوونی ئیمانیی دەکات و، چۆنیەتی باوەڕی نەتەوەی موسوڵمان بەهەموو پێغەمبەران و گشت پەرتووکە ئاسمانیەکان و کارە نادیارە غەیبیەکان و لەسەرو ئەوانیشەوە، لەگەڵ گوێڕایەڵی و مل کەچ بوونی تەواو بۆ خوای پەروەردگار:

﴿ ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٢٨٥﴾ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۚ لَهَا مَا كَسَبَتۡ وَعَلَيۡهَا مَا ٱكۡتَسَبَتۡۗ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذۡنَآ إِن نَّسِينَآ أَوۡ أَخۡطَأۡنَاۚ رَبَّنَا وَلَا تَحۡمِلۡ عَلَيۡنَآ إِصۡرٗا كَمَا حَمَلۡتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ

مِن قَبۡلِنَاۚ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلۡنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦۖ وَٱعۡفُ عَنَّا وَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَآۚ أَنتَ مَوۡلَىٰنَا فَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٢٨٦﴾ ﴾ البقرة: ٢٨٥ - ٢٨٦ .

**پاشـــان كۆتـــاو ســـەرەتا لەگـــەڵ يەكديـــدا يەكدەگرنـــەوەو بابەتـــەكانی ســـوورەتەكە لـــەنێوان دوو ســـيفەت لـــە ســـيفەتەكانی موســـوڵمانان و تايبەتمەنديەكانی ئيمان و باوەڕدا كۆدەبێتەوە ..**

*        *        *

﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴾

﴿ الٓمٓ ﴿١﴾ ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٢﴾ ... وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٩﴾

﴾ البقرة: ٢ - ٢٩

لەم بڕگەیەدا ، کە سەرەتای دەستپێکردنی ئەم سورەتە گەورەیە پێکدێنێ ، سیمای ئەو کۆمەڵە سەرەکیانە دەبینین کە بانگەوازەکە لەشاری مەدینە بەرەنگاریان بووەوە . کۆمەڵی جوەکان نەبێت کە تەنها ئاماژەیەکی بچووکیان بۆدەکرێت ، ئەوەندەش بەسە ، چونکە هەر ناوبردنیان بەرابەرو شەیتانی دووڕووەکان ، گەلێك لە ئاکارو بنچ و بناوانی ئەو رۆڵەی بینیان دەست نیشان دەکات ، تا پاش کەمێکی تر کە بەدوورو درێژی باسیان دەکرێت .

لەوێنەکێشانی ئەم لایەنانەشدا بەجوانی تایبەتمەندیەکانی گوزارشتە قورئانیەکان بەرچاو دەکەوێت ، کەوا لە وشەکان دەکات شوێنی هێڵ و رەنگەکان بگرنەوەو زۆر بەخێرایی و هەر لەنێو وشەکانەوە وێنەکان دەردەکەون .

ئالێرەدا ... لەچەند وشەو گوزارشتێکی کەمدا لەسەرەتای سورەتەکەدا سێ وێنەی سێ جۆر لە دەروون دەکێشرێت ، هەرجۆرێك لەوانە نمونەیەکی زیندووی کۆمەڵێکی زۆری مرۆڤن ، نمونەیەکی بنەڕەتی قووڵی دووبارەوەبوو لەهەر سات و کاتێکدا . کە لەهیچ سەردەم و لەهیچ شوێنێکیشدا مرۆڤایەتی لەم سێ جۆرانە بەدەرنیە.. ئائەوەیە ئیعجازو بێ وێنەیی ..

لەو چەند وتەو ئایەتە کەمانەدا ئەم وێنە ڕوون و تەواوو بێ کەم و کوڕیە ئەکێشرێ و ، ژیانیان بەراوردکراوەو، بەسیماو سیفاتێکی زۆر ورد ، سیفاتی

جوداو تایبەت، کە هەر باس کردنێك با زۆر تێر و تەسەل و دوورو درێژیش بێت ناگاتە ئاستی ئەم هێڵ دانانە خێراو ڕێك و گونجاو و پڕ مۆسیقایە .

کە ڕەوتەکە تەواو بوو لە پیشاندانی ئەم سێ وێنەیە، بانگی سەرجەم خەڵکی دەکات بەرەو وێنەی یەکەم .. هەر هەموویان بانگ دەکات .. تابچنە ژێر سێبەریەوە . بچنە ژێر سایەی یەکخوا پەرستیەوە ، یەك بەدیهێنەرو یەك ڕۆزیدەر ، بەبێ هاوبەش و بێ هاوتا.. بەرەنگاری ئەوانەش دەبووەوە کە گومانیان لە پەیامەکەی پێغەمبەر هەیە و (ﷺ) گومانیان لەهاتنەخوارەوەی ئەو پەرتووکە هەیەو پێیان دەڵێ گەر دەتوانن با سورەتێکی وەك ئەو بهێننەوە .. ئاگاداریشیان دەکاتەوە گەر پشت هەڵکەن لەم پەیامە و گوێ رایەڵی نەبن ئەوا سزایەکی سەخت و ترسناك چاوەڕێیان دەکات و، ئەوانەشی باوەڕیان پێیەتی و مل کەچی بوون مژدەی دانێ و ئەو نازو بەهرە نەبڕاوەی بۆ باس کردن کە لەچاوەڕێیان دایە .

ئینجا دەست بە بەرپەرچدانەوەی جولەکەکان و دووڕوەکان دەکات، ئەوانەی نارازی بوون کە خوای گەورە ئەو نمونانەی دەهێنایەوە لەناو قورئانداو، ئەمەیان کردە هۆکارێك بۆ گومانبردن لەوەی کە لە خواوە هاتبێتە خوارەوە و ئاگاداری کردنەوە لەمەبەستی ئەو نمونە و پەندانە ، نەبا زیاتر گومڕایان بکات ـ هەروەك چۆن بڕواداران زیاتر ڕێنمایی دەکات ـ هەروەها نارازی و سەرسامە کە باوەڕ بەو بەدیهێنەرە ناهێنن کە زیندووبوونەوەو مردن و هەمووگەردوون بەڕێوەدەباو هەر بەتەنها لە ژێر دە سەلاتی ئەودایە ، ئەو خوایەی زانایە بەهەموو شتێك لەم بوونەدا و هەر ئەویشە بەزەیی بەمرۆڤدا هاتەوە و گشت ئەو شتانەی بۆ دروست کرد بۆ سوود وەرگرتن و کردی بە جێنشین بەسەر ئەم هەموو سامانە گەورەو بەرفراوانەدا .

ئەوەبوو بەکورتی هێڵەسەرەکیەکانی وانەی یەکەمی سورەتی بەقەرە ، دەبا ئەم کورتەیە هەندێك درێژە پێ بدەین ..

ئەم سورەتە بەم سێ پیتە تاکانە دەست پێ دەکات (( ألف . لام. میم )).
پاشان باسی پەرتووکەکەی خوای گەورە دەکات ﴿ ذلك الكتاب لاريب فيه هدى للمتقين ﴾ ئەم پیتانەو چەند پیتێکی تریش کەلەسەرەتای هەندێك لە سورەتەکانی قورئاندا دێت . بۆ راڤــە کردنیان چەند بۆچونێك هەیە، یەکێکیان هەڵدەبژێرین کە دەڵێ بریتیە لە ئاماژە کردنێك بۆ تێبینی ئەوەی ئەم پەرتووکە لەهەمان ئەو پیتانە دارێژراوە کە ئەو خەڵکە عەرەبە ئاخاوتنی پێدەکەن ـ لەگەڵ ئەوەشدا ـ ئەم پەرتووکە بێ وێنەیەو هەرگیز ناتوانن بەو پیتە ئاساییانە پەرتوکێکی وا دابرێژن .. ئەو پەرتووکەی جار لەدوای جار رووبەروویان دەبێتەوەو دەڵێ گەر دەتوانن تەنها دە سورەتی لێبهێننەوە ، گەرنا تەنها بایەك سورەت بێت ، بەلام هەرگیز ناتوانن هیچ وەلامێك بۆ ئەم داوایە بدۆزنەوە !

کاری ئەم ئیعجازو بێ وێنەییەش وەك کارو مەبەستی هەموو بوونەوەرەکانی خوای مەزن وایە ، هەروەك دەستکردەکانی خواو دەستکردەکانی مرۆڤ وایە لەهەموو شتێکدا. ئەم خۆڵی سەر زەویە لەو گەردیلانە پێك هاتووە کە مرۆڤ سیفاتەکانیان دەزانێت، جا کە مرۆڤ مامەڵە لەکەڵ ئەم گەردیلانەدا دەکات ئەوپەری بتوانێ دایرێژێت تەنها خشتێك یا قاپێك یا لوولەیەك یا پەیکەرێك وە یا ئامێرێکە . هەرچەندە زۆر رێك و پێکیش بێت ... بەلام خوای بەدیهێنەر لەو گەردیلانە ژیان پەیدا دەکات. ژیانێکی بزاوتی جوڵێنەر ، کە نهێنیە بێ وێنەکەی خوا دەنوێنێ .. نهێنی ژیان .. ئەو نهێنیە لە دەسەلاتی هیچ مرۆڤێکدا نیە، کەسیش پەی پێ نابات.. هەروەها قورئانیش هەروایە .. چەند پیت و وشەیەك کە مرۆڤ تەنها وتەو کێشی لێ دروست دەکات بەلام خوای گەورە قورئان و جیاکەرەوەی لێ پێك دێنێت، جیاوازی نێوان دەستکردی مرۆڤ و دەستکردی خوا لەم پیت و

وشانه هەمان جیوازیە کە لەنێوان لاشەیەکی مردوو و گیانێکی زیندوودا هەیە .. هەر ئەو جیاوازیەشە کە لەنێوان شێوەی ژیان و ڕاستی ژیاندا هەیە !

﴿ ذلك الكتاب لاريب فيه ﴾ .. جا ئیتر لەکوێوە گومان و دوودڵی دێت، کە بەڵگەی ڕاستی و دڵنیایی لەم سەرەتایەدا خۆی شاردبێتەوە، هەروەها لەبێ دەسەلاتیاندا دیارە کە ناتوانن وێنەیەکی وەك ئەو بێننەوە کە هەر لەو پیتانەی خۆیان بەکاریان دێنن ودەیانناسن داڕێژراوە وهەر لەناو زمانەکەی خۆشیاندا هەیە؟

﴿ ذلك الكتاب لاريب فيه .. هدى للمتقين ﴾ ..ڕێنمایی کردن لە ڕاسترین و دروسترین شێوازیدا و بەگیان و سروشتی ڕاستەقینەوە .. بەلام بۆ کێ ؟ بۆ کێ ئەو پەڕتووکە ڕێنماو ڕوناکی بەخش و ڕابەرێکی ڕوون و ئاشکرا و بەسوودە ؟.. بۆ ئەوانەی لەخوا ئەترسن... چونکە لەخواترسان و خۆپاراستن لەناو دڵدا وادەکات کەڵك و سوود لەم پەڕتووکە وەربگیرێت. هەر ئەوە دەرگا داخراوەکانی ناو دڵ دەکاتەوەو دێتە ناویەوە و ڕۆڵی خۆی لەوێ ئەبینێ. هەر ئەویشە ئەو دڵە ئامادە دەکات بۆ هەڵبژاردن و بۆ وەرگرتن و بۆ وەلامدانەوەش .

ئەو کەسەی بیەوێ ڕێنمایی لە قورئان وەربگرێت ئەبێ بەدڵێکی ئێجگار پاکەوە و، بەدڵێکی دڵسۆزەوە بەرەو پیری بێت و هەر ئەبێ بەدڵێکی لەخوا ترس و مل کەچەوە بێتە خزمەتی، ئەبێ ئەوکەسە ئاگای لەوەش بێ نەبا گومڕا بێت، وەیا ئارەزووی گومڕایی و لادانی لەنێو دڵدا بێت .. ئا لەو کاتانەدا قورئان نهێنیەکان و ڕوناکیەکانی خۆی والا دەکات و دەیبەخشێ و دەیانڕێژێتە ناو ئەو دڵەی بەرەو ڕووی دێ و لەخواترسەو هەستیارو ئامادەیە بۆ وەرگرتن .. لە عومەری کوڕی خەتاب ـ خوای لێڕازی بێت ـ دەگێڕنەوە کە دەربارەی مانای لەخوا ترسان لە ئوبەی کوڕی کەعبی پرسیوە، ئەویش پێی وتووە : ئایا بەڕێگایەکی دڕکاویدا نەڕۆشتوویت ؟ وتی : بەڵێ! وتی : جا

چیت کرد ؟ وتی: خۆم هەڵکرد و خۆشم پاراست . وتی: ئیتر ئا ئەوەیە لە خواترسان ..

ئەوەیە لەخوا ترسان .. هەستیاری لە ویژداندا و هەست و نەستێکی ناسك و ترسێکی هەمیشەیی و، وریاییەکی بەردەوام و خۆپاراستن لە درکەکانی سەرەڕێ.. ڕێگای ژیان .. ئەو ژیانەی لەبێنەو بردایە لەنێوان درکەکانی ئارەزوو و ئاواتەکان و، درکەکانی چاوچنۆکی و چڵێسی و، درکەکانی سامناکی و ترسەکان و، درکەکانی داوا پوچەڵەکان ، لەو هێزانەی کە توانای بەدەنگەوە هاتنی خواستەکانیان نیەو، ترسی ناڕەوا لەو کەسانەی توانای سوود و زیان گەیاندنیان نیە و ، دەیەها درکی تریش !

پاشان ڕەوتەکە دەست بە باسکردنی سیفاتی خوا پەرستان و لەخواترسان دەکات ، کە سیفاتی بڕواداره بەرایپیەکانی شاری مەدینەیە، هەروەها سیفەتی بڕواداره دڵسۆزەکانی ئەم نەتەوەیەیە لەگشت کات و سەردەمێکدا:

﴿ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ وَٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ وَبِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ﴿٤﴾ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٥﴾ ﴾ البقرة: ٣ - ٥

سیمای یەکەمی لەخواترسان بریتیە لەیەکێتی هەستەوەریی ڕاست وکاریگەر. یەکیەتیەك کەلەدەروونیاندا باوەڕ بەکارە نادیارو غەیبیەکان گرێ دەدات بەجێبەجێکردنی ئەرکە پێویستەکان (الفرائض) و باوەڕ هێنان بەهەموو پێغەمبەران و دڵنیابوون بە ڕۆژی دوایی .. کە ئەو دیاردە تەواوو بێ کەم و کوڕیەی بوە نیشانەیەکی دیاری باوەڕو عەقیدەی ئیسلامیی و، سیمای ئەو دەروونانەیە کە باوەڕیان بەم دیاریی باوەڕو عەقیدەیە هەیە، کەواتە وا شیاوو ڕاستە کە ببێتە دواین بیرو عەقیدە بۆ هەموو ئادەمیزادان تا لێی کۆببنەوە و باڵی بەسەر هەموو مرۆڤایەتیدا بکێشێت و هەرهەمووشیان بە هەموو هەست و بەبەرنامەی ژیانیانەوە ، ژیانێکی سەرتاسەری لەسایەیدا بژین .. کە هەموو لایەنەکانی هەست و ڕەفتارو بیروباوەڕو یاساکانیان بگرێتەوە . خۆ ئەگەر ئێمە پتر باسی سیمای یەکەمی موسوڵمانە لەخواترسەکان بکەین و بچینە بنج و بناوانی ئەو بنەمایانەی پێکیان دێنێت ، ئەوا چەند بەهایەکی بنەڕەتیمان لەژیانی سەرجەم مرۆڤایەتیدا بۆدەردەکەوێت ..

﴿ الذین یؤمنون بالغیب ﴾ .. کەواتە ئەو بەربەستانە نامێنێت کە ڕێبگرێت لەبەردەم یەکگرتنەوەی ڕۆح و گیانیان لەگەڵ ئەو هێزە باڵایەی کە لێوەی پەیدا بووە ، هەروەها ئەو بەربەستە هەستیانەی لەنێوان گیانیان و هەموو ئەو شتانەی لەسەروو هەستەوەن، لەڕاستیەکان و هێزو وزە و گیانەوەرو گشت بوونەوەرەکانی تریش، ئەم بەربەستانە هیچیان نامێنن .

باوەڕهێنان بە غەیب و کارە نادیارەکان ئەو بەربەستەیە کە مرۆڤــ دەیبڕێ و لە پلەی ئاژەڵی ئەپەڕێتەوە ، کە تەنها هەست بەو شتانە دەکات کە ئەندامە هەستیارەکانی هەستی پــێ دەکـەن و، دەپەڕێتـەوە بۆ پلـەی ئـادەمیزاد کـە هەست بەگەورەیی و گشتگیری ئەم بوونەوەرە دەکا و هەست ئەکات بوونەوەر گــەورەترو دامێنگیرتــرە لــەو بــوارە بــچووکە ســنووردارەی کــە ئەندامــە هەســتیارەکانی هەســتی پــێ دەکــەن ، ئـەم پەڕینەوەیـە کاریگەریـەکی گـەورە دەکاتــە ســەر بۆچــوونی ئــادەمیزاد بــۆ ڕاســتیەکانی بوونــەوەرو ڕاســتیەکانی بــوونی خــودی مرۆڤـــ و ڕاســتی ئــەو هێزانــەی لــە قــەوارەی ئــەم بوونــەوە هەڵــدەقوڵێن ، هــەروەها کاریگەریــەکی زۆری هەیــە لەســەر هەســت کــردن بەگەردوون و ئـەو توانـای بەڕێوەبردنـەی لەسـەروو گەردوونیشەوەن ، دیسان ئەوە شوێنکارێکی بەهێزی هەیە بۆ ژیانی سەر زەویش ، چونکە ئەو کەسەی لـە بوارێکی بچوکدا بژی کە تـەنها ئەندامـەکانی هەسـتی پـێ دەکـات هـەرگیز وەك ئەو مرۆڤــە نیە لە گەردونێکی گەورەو فراواندا بژی کە دیدو بیرو بینایی هەموویان هەستی پێ دەکات و، ئەو ڕەنگدانـەوە و سروشـتانەی لە دووتـوێی قولاییاندایە وەردەگرێ و هەست بـەوە دەکـات کە بواریـان فـراوانترە لەسـات و کات و لەسەرجەم ئەو شتانەی هەست و نەست درکیان پێ دەکات لەو تەمەنە کـورت و کەمەیـداو، هەســت بــەوە دەکـات لەســەروو گەردوونـەوە ، چ دیـارو نادیار ، ڕاستیەکی گەورەتر لە گەردووندا هەیە کە بوونی خۆی لـەبوونی ئـەو ڕاستیە مەزنەوە وەرگرتـووە .. ڕاسـتیی خـودی خواوەنـدە، ئـەو خوایـەی چاو نایبینێ و عەقڵ و هزریش بە تەواوی پەی بەگەورەیی و مەزنیی نابات .

لەم کاتانـەدا ئـەو وزە فیکریـە سنووردارە دەپـارێزرێ لـە پـەرت و بڵاوی و پچڕپــچڕی و گیرۆدەبــوونی ئــەو مەبەســتانە کــە بــۆی دروســت نــەکراوە، کەجەســتەش توانــای زانینیــانی نــەدراوەتێ و تێیــان ناگــات ، هــەروەها ئــەو شتانەش هەر هەوڵێکیان تیابدرێ بێ کەڵك و بێ سـوودن ، ئـەو وزە فیکریـەی

بەخشیویەتی بە مرۆڤ، داویەتێ بۆ پیادەکردنی جێنشینیی لەسەر زەوی ، جا ئەو وزەیە ئەم ژیانە نزیکە دەستەی خراوەتە ئەستۆ، تاتێی بڕوانێ و لێی وردبێتەوەو توێژینەوەی تیابکات و کارو بەرهەمی هەبێت و ژیان بگەشێنێتەوە و بیڕازێنێتەوە ، بەمەرجێك پشت بەو وزە گیانیە ببەستێت کە ڕاستەوخۆ پەیوەستە بە بوون و بەدیهێنەری بوونەوەو، هەروەها بەشێکیش بۆ ئەو کارە شاراوەو نادیارانە دابنێت کە لە غەیبدان و هزرو مێشك پەی بەنهێنیان نابات . بەڵام هەوڵدان بۆ تێگەیشتن لەو شتانەی لەپشت واقیعەوەن بەئامرازەکانی عەقڵیی و وزەی سنووردار بەسنووری ژیانی سەرزەوی بەبێ پاڵپشتێك لەگیان و ڕۆحی سرووش بەخش و بەبێ دیدێکی کراوەو، دانانی بەشێك بۆ کارە غەیب و نادیارەکان کە عەقڵ و هزر نایانگاتێ .. ئا ئەم هەوڵدانە هەر لەسەرەتاوە سەرنەکەوتوو دەبێ و لەکۆتایشدا هەر بێکەڵك و بێ سوودە . سەرنەکەوتوو دەبێ چونکە کەرەسەیەکی وا بەکاردێنێ کە بۆ ئەم بوارە دانەنراوە و ، بێسوودیشە چونکە وزەکانی هزرو ژیریش کە بۆ ئەم بوارە تەرخان کراوە پەرت و بڵاو دەکاتەوە .. هەرکاتێکیش هزرو ژیری مرۆڤ خۆی دا بەدەستەوە بۆ ئەو بەڵگە نەویستە ژیریە کە ئەڵێ سنووردار ناگاتە ڕێگای بێ سنوور ، پێویستە ـ وەك ڕێز لێنان لە خودی خۆی ـ دان بەوەشدا بنێت کە زانین و گەیشتن بەڕەهای بێ سنوور کارێکی نەکراوە و مەحاڵە، وە نەزانین و تێنەگەیشتن لەدیاردە نادیارەکان مانای ئەوەنیە کە لە کرۆکی غەیب و نادیاردا بوونی نیە، بۆیە پێویستە لەسەر مرۆڤ غەیب و نادیار بداتە دەست هێز و وزەیەکی گەورەتر بەدەر لە وزەی هزرو ژیریی خۆی ، ئەبێ زانیاریەکانی دەربارەی ئەو غەیبە لەو هێزە زاناو دانایە وەرگرێت کە سنووری دەرەوەو ناوەوەو دیارو نادیاریش دەزانێ ، ئەم ڕێزلێنانەش بۆ هزرو ژیریی لەم دیاردەیەدا بریتیە لە سیمای جوان و بەرزی باوەڕداران و، سیفەتی یەکەمین مرۆڤە لەخوا ترسەکان .

باوەڕبوون بە غەیبی نادیار دووڕیانێك بوو بۆ بەرز بوونەوەی مرۆڤــ لەئاستی جیهانی ئاژەڵیی . بەڵام کۆمەڵگا ماددیەکانی ڕۆژگاری ئەمڕۆ هەروەك کۆمەلانی خەڵکی ماددی لەگشت سەردەمێکدا دەیانەوێ مرۆڤــ بەرەوپاش ببەنەوە .. بەرەو جیهانی ئاژەڵیی، کە تەنها شتە هەست پێکراوەکان بوونیان هەیە تیایدا ، ئەمەش بە (( پێشکەوتن خوازی )) ناودەبەن ، کەچی ئەمە ئەو هەرەس و نسکۆ لێژەیە کە خوای گەورە باوەڕدارانی لێپاراستووە و سیفەتی تایبەت و جوداکەرەوەیانە و بە: ﴿ الذین یؤمنون بالغیب﴾ ناوی بردوون ...سوپاس و ستایشی بێ سنوور بۆ خوای مەزن کە ئەو بەهرە گەورەیەی پێ بەخشیوین و هەرەس و دارمانیش بۆ بەزیوان و بەڕۆخاچوان !

﴿ ویقیمون الصلاة ﴾ .. تەنها بۆخوا کڕنووش دەبەن و هەر ئەو دەپەرستن ، بەمەش لەبەندە پەرستی و کەرەسە پەرستی ڕزگاریان ئەبێ و ، بەوپەڕی سەربەستیەوە ڕوودەکەنە ئەو هێزە پیرۆزە ڕەهایەو ، تەنها بۆ خوای مەزن سەردائەنەوێنن نەك بۆ بەندەکانی ئەو، ئەو دڵەش کە تەنها و بەڕاستی بۆخوا سوژدەببات و بەدرێژایی شەووڕۆژ هەر لەوەوە نزیك بێت ، هەست بەوەدەکات کە بوونی خۆی پەیوەستە بەو هێزە کە هەبوونی پێویستەو ، ئەزانێ مەبەستی ژیانی زۆر لەوە گەورەترە کە تەنها لەسەر زەوی و پێویستیەکانی ژیانی سەر زەوی کۆتایی پێبێت ، وە هەر لەبەر ئەو پەیوەندیە پیرۆزەی کەهەیەتی لەگەڵ بەدیهێنەری بوونەوەراندا هەست دەکات لەسەرجەم ئەو بوونەوەرانە بەهێزو تواناترە .. ئەمانە هەمووی سەرچاوەی هێزن بۆ ویژدان و، سەرچاوەشن بۆ لەخواترسان و خۆپاراستن و ، هۆکارێکی گەڵێ گرنگن بۆ پەروەردەکردنی کەسایەتی ، تاوای لێبێت هەموو بۆچوون و تێڕوانینەکانی خوایی بێت و هەست و ڕەوشتیشی خوایی و پیرۆز بن ..

﴿ ومما رزقناهم ينفقون ﴾ .. ئەوان لەسەرەتاوە دان بەوەدا ئەنێن کە ئەوپارەو سامانەی لەدەستیاندایە بەهرەی خوایەو بەوانی بەخشیوە نەك دروست کراوی دەستی خۆیان بێت ، ئا لەم دانپیانانەدا بەنیعمەتی ڕۆزیی لەخوای گەورە وەو چاکەکردن لەگەڵ هەژاراندا دەست پێدەکات و هاوکاری لەنێو بەندەکانی خوادا پەیدا دەبێ و هەستکردن بەپەیوەندیە مرۆییەکان و برایەتی مرۆڤایەتی گەلاڵە دەبێت ، بەهای گرنگی ئەمانەش هەمووی لە پاککردنەوەی دەروون لە هەرگیری و چاوچنۆکی و ڕژدیەکدا دەردەکەوێ ، هەروەها لەخاوێن کردنەوەی ئەو دەروونە بەچاکەو چاکەخوازی و ، بەهاو نرخی لەوەشدایە کە ژیان دەکاتە گۆڕەپانی هاریکاری و یارمەتیدان نەك گۆڕەپانی بەیەکدادان و ململانێی نابەجێو، پەککەوتەو لانەوازو بێدەسەڵاتانیش دڵنیا دەکاو ئەو هەستەیان لادەڕوێنێ کە ئەمان لە ئامێزو لەناو دڵ و دەروونداان نەك لەنێو نینۆك و چنگ و کەڵبەدابن !

بەخشینی زەکات و سەدەقەو هەموو ئەو شتانەی لەچاکەو چاکەخوازیدا دەبەخشرێت دەگرێتەوەو، ماڵ بەخشین پێش ئەوەی زەکات پێویست بکرێت بەیاسا دانرابوو چونکە ماڵ بەخشین ئەو بنچینە سەرانسەریەیە کە دەقەکانی زەکات تایبەتمەندیان دەکات و نایانسڕێتەوە، لەفەرموودەیەکی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە : (( إن في المال حقا سوى الزكاة ))[1] بڕیاردانی ئەو یاسایە بەو کۆگیریە مەبەست و ئامانج بوو کە پێش پێویست کردنی زەکاتیش دانرابوون .

﴿ والذين يؤمنون بما انزل اليك وما انزل من قبلك ﴾ .. سیماو سیفەتی شیاوی نەتەوەی موسوڵمانە ، جێگرانی بیروباوەڕە ئاسمانیەکان و، جێگرانی پێغەمبەرایەتی لەبەرەبەیانی مرۆڤایەتیەوەو، پارێزەری ئەو بۆماوە

---

[1] أخرجه الترمذي.

بیروباوەڕیو پێغەمبەرایەتیەیەو، ڕابەری کاروانی باوەڕ لەسەر زەویدا تا ژیان کۆتایی پێدێت ، بەهای ئەم سیمایەش هەست کردنە بە یەکێتی مرۆڤایەتی و یەکێتی ئاینەکانیان و یەکێتی پێغەمبەران و پەرستراوەکانیان.. بەهاو نرخی خاوێن کردنەوەی گیان و دەروونە لەهەر دەمارگیریەکی ناڕەوا دژی ئاینەکان و بڕواداڕانی ئەو ئاینانە کاتێ لەسەر ڕێی ڕاستیان بەردەوام دەبن .. بەهاو نرخی دڵنیاییە بەچاودێری کردنی خوا بۆ مرۆڤایەتی بەدرێژایی نەوەو سەردەمەکانی، ئەو چاودێریەی لەبەردەوام هاتنی پێغەمبەران و پەیامەکاندا بەیەك ئاین و یەك ڕێنمایی ڕەنگدەداتەوە. بەهاکەی ئەو سەربەرزی و شکۆداریەیە بەو ڕێنماییەی کە ڕۆژگار دێودەڕوا بەڵام ئەو ڕێنماییە نەگۆڕەو چەسپاوە ، هەروەك ئەستێرەیەکی ڕابەری ڕێنیشاندەر لەتاریکایی شەوە زەنگدا ڕۆشن و ڕووناکی بەخشە ...

﴿ وبالآخرة هم یوقنون ﴾ .. ئەمەیان کۆتایی سیماکانە ، ئەو کۆتاییەی ژیانی ئەم جیهان و دونیایە گرێ دەدات بەڕۆژی دوایی و، سەرەتا دەبەستێت بە ئاکامەوەو کردەوەش بە پاداشتەوە و، مرۆڤ هەست بەوە دەکات کە پشت گوێ نەخراوەو هەروا بەبێ هوودە دروست نەکراوەو بێنرخ و بێ بەها نیەو دادپەروەریەکی ڕەها چاوەڕێیەتی ، ئیتر ئەوکەسە دڵنیا دەبێ و مێشکی ئارام دەگرێ و کاری چاکەو چاکسازی پیشەی دەبێو لەسایەی دادپەروەری و بەزەیی خوای گەورەدا دڵنیا دەبێ و لەنگەر ئەگرێ .

دڵنیابوون بە ڕۆژی دوایی بریتیە لە دووریانی یەکلاکەرەوەی نێوان ئەو کەسانەی لەنێو دیوارەکانی هەستی داخراودا دەژین و ئەوانەی لەم بوونەوەرە بەرفراوانەدا ئەژین ، نێوان ئەو کەسەی وا ئەزانێ تەنها ژیانی سەر زەوی مەبەستەو هەموو ئامانجێکە لەبووونداو، نێوان ئەو کەسەی هەست ئەکات ژیانی سەر ئەم زەویە تاقیکردنەوەیەکەو پاداشتی لەدوایەو ژیانی ڕاستەقینە لەولایە ، لەپشت ئەم بوارە بچوکە سنووردارەوەیە .

هەر سیفەتێك لەم سیفەتانە ـ وەك بینیمان ـ نرخ و بەهای خۆی هەیە لە ژیـانی مرۆڤــایەتیدا و سـیمای مرۆڤــی لەخواترســە و، ڕێـك و پێكـی و گونجـانیش لـەنێوان ئـەم سـیفەتانەدا وابـەدی دەكرێـت كـە ببنـە مایـەی یـەك پارچـەیی تـەواو و تۆكمـەو داڕێـژراو، چـونكە لـەخوا ترسـان هەسـتێكە لـەناو ویژدانـدا و دۆخێكـی تایبـەتی نـاو نـاخی مرۆیـە، كـە چـەندەها ئاڕاسـتەو ڕەفتـاری لێـوە دروسـت دەبـێ و هەسـت و نەسـتەكانی نـاوەوەو ڕەوشـتە ڕواڵەتیەكانیشی پێ یەكگیردەبێت و مرۆڤـ ئەگەیەنێت بەخوای تاك و تـەنها لـەنهێنی و ئاشـكرایدا . هـەر بەوپێیـە گیـان ڕوون و بـێگرێ ئـەبێت و ئـەو پەردانـە تـەنك دەبنـەوە كـە ڕێ لـە ڕووناكیـە گـشتیەكەی هـەردوو جیهـانی ئاشـكراو شـاراوە دەگرێـت و زانـراو و نـەزانراو بەیـەك ئەگەیـەنێت و هەركاتێكیش ڕوون و بێگەرد بوو، وە ئـەو پەردەیـەی نێوان شێوەو نـاوەڕۆك نـەما ئەوكاتـە بـاوەڕبوون بـە غـەیبی نادیـار ئەبێتـە بەرهـەمی سروشـتیی بـۆ هــەڵماڵینی پــەردە ئەســتوورەكان و گەیــشتنی گیــان و ڕۆح بــە غــەیب و دڵنیـابوون لێیـان . هـەر لەگـەڵ لەخواترسـان و بڕوابـوون بـە غـەیبی نادیـار شێوەی ڕاستی خواپەرستن دێتەئاراوە كە خوای گەورە خۆی هەڵیبـژاردووە و كردوێتیە پەیوەستی نێوان پەروەردگارو بەندەكانی . هەروەها دەست بڵاوی و بەخشینی بەشێك لەڕۆزی دەبێتـە نیشانەیەك بۆ دانپیانـان و پێـزانین بـەو بەخششە جوانەی خوازی مەزن و هەست كردن بە برایەتی و، ئینجا فراوانیـی ویـژدان بۆ كـاروانی بـاوەڕی دێـرین و هەسـت بـە پەیوەندیـەكی بـەتین لەگـەڵ هـەموو خـاوەن بـاوەڕو هـەموو پێغەمبـەرێك و گـشت پەیامـەكان ، هـەروەها دڵنیابوون بەڕۆژی دوایـی بەبێ دوو دڵـی و بەبێ گومـان لـەم دڵنیاییە . ئەمـە وێنـەی ئـەو كۆمەڵـە موسـوڵمانەبوو كـە لـەو ڕۆژگـارەداو لەشـاری مەدینـەدا دروسـت بـوو ، كـە لـە موسـوڵمانە بەراییـەكان پێكهـاتبوو چ كۆچـكەران و چ لایـەنگرانیان و ئـەم كۆمەڵەیـە بـەو سیما تایبەتیانـەی ، دیاردەیـەكی ئێجگـار

گەورەبوو . بەڕاستی مەزن بوو ، هەر لەبەر ئەو ڕاستیە ئیمانیەی کە خۆی دەنواند لەناوڕیزەکانیدا، ئیتر خوای گەورە لەم کۆمەڵە خاوێنە چەندەها دیاردەی گەورە و بەنرخی دروست کرد لەسەر زەوی و لەژیانی هەموو مرۆڤدا . بۆیە ئەم بڕیارە پیرۆزە ئەدات :

﴿ أولئك على هدى من ربهم و أولئك هم المفلحون ﴾

بەم شێوەیە ڕێگا ڕۆشن و ڕێنمابوون و هەر بەو شێوەیەش سەرکەوتووبوون و، بێگومان ڕێگای بەرەو سەرفرازیو ڕێنماییش هەر ئەو ڕێگا نەخشە کێشراوو دیارەیە .

بەڵام وێنەی دووەم وێنەی بێباوەڕانە ، کە بریتیە لە بنەماکانی بێ باوەڕیی لەهەر زەویەك و لەهەر ساتێکیشدا .

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ سَوَآءٌ عَلَيْهِمْ ءَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٦﴾ خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَعَلَىٰ سَمْعِهِمْ ۖ وَعَلَىٰٓ أَبْصَٰرِهِمْ غِشَٰوَةٌ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٧﴾﴾ البقرة: ٦ - ٧

لێرەدا بەتەواوی شێوەی بەرانبەری وێنەی خواپەرستان و وێنەی بێباوەڕان ئەبینین .. جا ئەگەر ئەو پەڕتووکە خۆی لەخۆیدا ڕێنماکەربێت بۆ بڕوادارو لەخوا ترسەکان ، ئەوا ئاگادارکردنەوە یا ئاگادارنەکردنەوەی بێباوەڕان وەك یەك وایەو هیچ جیاوازیەکی نیە .. دەروازەکراوەکانی گیانی خواپەرستان و ئەو پەیوەندیانەی دەیانگەیەنێت بەبوون و بەدیهێنەری بوونەوە و هەروەها بەڕواڵەت و ناوەڕۆکی غەیب و کارە نادیارو کارە ئاشکراکانیش .. ئەم دەروازە کراوانە هەرهەموویان ئاوەڵاو لەسەرپشتن لای ئەوان ، بەڵام لێرە لای بێباوەڕان، سەرجەم دەروازەکان داخراون و پەیوەندیە بەیەك گەیشتووەکان لەوێ هەموو ئامادەن ، کەچی لێرە دابڕاون و لەیەك جودان ..

﴿ ختم الله على قلوبهم وعلى سمعهم ﴾ مۆریان لێدراوە ، بۆیە هیچ ڕاستیەکی ڕێنمایی نایانگاتێ . ﴿ وعلى ابصارهم غشاوة ﴾ .. هیچ ڕووناکیەکیش تروسکایی ناداتێ و ڕێی پیشان نادات . خوای گەورە دڵ و گوێی داخستوون و پەردەی تاریکی بەسەر دیدەکانیاندا هێناوە . لە تۆڵەی گاڵتە پێکردنیان بەو ئاگادارکردنەوەو وریاکردنەوەیەدا ، تارادەیەك کە بەئاگاهێنانەوەو هۆشیارکردنەوەیان یاخود نەکردنەوەیان وەك یەکی لێهاتووەو بایەخی نیە لایان .

ئیتر ئائەمەیان وێنەیەکی زەق و تاریکی بێگیانە ، کە هێڵەکانی لەنێو ئەو بزاڤە توندوتیژو چەسپاوە دا ڕائەکێشرێ . بزاڤــی مۆرکردنی دڵ و گوێکان و تاریککردنی چاوو دیدەکان ...!

﴿ ولهم عـذاب عظـــيم ﴾ .. ئەمـە کۆتاییـەکی سروشـتیە بـۆ سـووربوون لەسـەر بێبـاوەڕیی ... بۆئەوکـە سـەی بـەدەم ئاگادارکردنـەوە نایـەت و گـوێی ناداتـێ و ئاگادارکردنـەوەو هۆشـیارکردنەوە یـاخود نەکردنـەوەی لاوەك یـەك وایە ، کەخوای گەورە خۆی بەزانایی بێسنووری خۆی ئەم ڕەوشتە نەگریس و سروشتە ڕەق و ڕۆچووەیانی زۆر باش ئەزانی .

پاشان لەگەڵ ڕەوتەکەدا بەرەو وێنەی سێیەم یا نمونەی سێیەم دەڕۆین :

ئـەمیان وەك وێنـەی یەکـەم ڕوون و بێگـەردو لێبـووردە نیـەو وەك وێنـەی دووەمـیش تاریـك و ڕەش و ڕقـاوی نیـە ، بـەڵام لـەناو هەسـتدا گرمۆڵـە بـووەو لوول دەخوا . لەچاو ون دەبێ و دێ و دەڕوا .. ئەویش وێنەی دووڕووانە :

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ ﴿٨﴾ يُخَـٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿٩﴾ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ ﴿١٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ قَالُوٓا۟ إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ ﴿١١﴾ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلْمُفْسِدُونَ وَلَـٰكِن لَّا يَشْعُرُونَ ﴿١٢﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُوا۟ كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ قَالُوٓا۟ أَنُؤْمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُ ۗ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ وَلَـٰكِن لَّا يَعْلَمُونَ ﴿١٣﴾ وَإِذَا لَقُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوْا۟ إِلَىٰ شَيَـٰطِينِهِمْ قَالُوٓا۟ إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ ﴿١٤﴾ ٱللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ وَيَمُدُّهُمْ فِى طُغْيَـٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١٥﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُا۟ ٱلضَّلَـٰلَةَ بِٱلْهُدَىٰ فَمَا رَبِحَت تِّجَـٰرَتُهُمْ وَمَا كَانُوا۟ مُهْتَدِينَ ﴿١٦﴾ ﴾ البقرة: ٨ - ١٦

ئەم وێنەیە بەڕاستی و بەدروستی لەشاری مەدینەدا هەبوو، بەڵام گەر ئێمە سنووری شوێن و كات ببڕین دەبینین وێنەونمونەیەكی دووبارەوەبووی هەموو نەوەكانی مرۆڤایەتیە . ئەم جۆرە دووڕوویيە لەو كەڵەپیاوانەدا بەدیدەكەین كە ئازایەتیەكی وا لەخۆیاندا نابینن كە بەباوەڕێكی ڕوون و ئاشكراوە بەرەنگاریی ڕاستیەكان ببنەوە ، یاخود لەدەروونیاندا ئەو ئازایەتیە بەدی ناكەن كە بەرەنگاری ئەو ڕاستیانە ببنەوە كە نایانەوێ و پشتی تێدەكەن ، لەگەڵ ئەوەشدا بەچاوێكی كەمەوە سەیری ئەو خەڵكەی دەوروپشتیان ئەكەن و خۆیان زۆر پێ گەورەیەو بۆچوونی ئەو خەڵكەش بەكەم دادەنێن .. دواتر لائەكەینەوە بەلای بەرەوڕووبوونەوەی ئەو دەقانە ،

هەروەك ڕەهابن و پابەندی ئەو بۆنە مێژووییە تایبەتە نەبن و، ئاڕاستەی ئەو دەستەیە لە دووڕووان کرابێت ـ لەهەموو سەردەمێکداو ـ ئاڕاستەی کرۆکی دەروونی مرۆڤایەتی کرابێت لەگشت نەوەکانیدا .

ئەوانە گوایە بڕوایان بەخواو بەڕۆژی دوایی هێناوە . بەڵام لەڕاستیدا بڕوایان نیە . بەڵکو دووڕوون و ناوێرن بە ئاشکراو بەڕاشکاوی ڕای خۆیان دەربڕن دەربارەی باوەڕداران و موسوڵمانان.

لەگەڵ خودی خۆشیاندا وائەزانن زیرەك و لێزانن و توانای هەڵخەڵەتاندنی ئەو خەڵکە خاوێن و دڵپاکانەیان هەیە ، بەڵام قورئان ڕاستی ئەو کارو ڕەفتارەیان باسدەکات ، کەئەوان ئەو موسوڵمانە باوەڕدارانە هەڵناخەڵەتێنن بەڵکو نیازیان وایە بەوشێوازە خوای مەزن هەڵبخەڵەتێنن :

﴿ يخادعون الله والذين آمنوا ﴾ ..

لەم دەقەو لەدەقەکانی وەك ئەمدا لەبەردەم ڕاستیەکی گەورەدا خۆمان دەبینینەوە ، لەبەردەم بەخششێکی گەورەی خوای مەزندا .. ئەو ڕاستیەی قورئان دەریدەخاو بەردەوام ئەیدرکێنێ ، ئەویش پەیوەندی نێوان خواو موسوڵمانانە . کە ڕیزی ئەوان بەڕیزی خۆی دادەنێ و، کاری ئەوان بەکارو پیشەی خۆی دادەنێ و، ئەیانخاتە پەنای خۆی و، دوژمنانیان بە دوژمنی خۆی ئەزانێ و، ئەو پیلانانەی دەربارەیان دەکرێ وەك بەرامبەر ئەو کرابێ وایە ـ سبحانه ـ ئەوەیە ئەو بەخششە بڵندە بێ وێنەو بێ هاوتایە .. بەخششێك پلەو پایەی ڕاستی باوەڕدارە موسوڵمانەکان بڵند ئەکاتەوە بەرەو ئەو لوتکە بەرزە ، ئەو ئاستەی ڕاستیی ئیمان و باوەڕ لەم بوونەدا بەگەورەترین و گرنگترین ڕاستیەکان دەزانێت ، ئەمەش دڵنیاییەکی بێ سنوور ئەڕژێنێتە نێو دڵی موسوڵمانەوە ، کاتێ کە ئەبینێ خوای گەورە ـ جل شأنه ـ کێشەی ئەم دەکاتە کێشەی خۆی و جەنگی ئەمیش جەنگی ئەوەو دوژمنیشی دوژمنێتی ، ئەیخاتە ڕیزی خۆیەوەو بەرەو پەنای بڵندو

پیرۆزی خۆی هەڵیدەکێشێ .. جائیتر بەندەکان و فێڵ و پیلان و ئەشکەنجە ساکارەکانیان چ بایەخێکیان دەبێت لای ئەو موسوڵمانە باوەڕدارانە؟!

لەهەمان کاتیشدا هەڕەشەیەکی ترسناکە بۆئەوانەی هەوڵی فریودان و فێڵبازی لەگەڵ موسوڵماناندا ئەدەن و دەیانەوێت ئازاریان بدەن ، هەڕەشەیە بەوەی ئەو رەفتارو شەڕەنگێزیەیان بەتەنها لەگەڵ موسوڵماناندا نیە بەڵکو لەگەڵ خوای بالآدەست و لەڕادەبەدەر بەهێزدایە ، ئەوان کاتێ لەگەڵ یارانی خوادا ئەجەنگێن وەك لەگەڵ خوای گەورەدا بجەنگێن وایە ، وە کاتێ ئەم هەوڵە نزم و نەگریسانە ئەدەن ئەوە خۆیان ئەخەنە بەر رق و نیگەرانی خوای گەورەو بالأدەستەوە .

ئەم ڕاستیە شایانی ئەوەیە لەهەردوو لایەنەکەیەوە موسوڵمانان تێی بڕوانن و لێی وردبنەوە تادڵنیاو چەسپاوو بەردەوام بن لەسەر کاروانەکەیان و گوێ نەدەنە پیلانی پیلانگێڕان و فێڵی فێڵبازان و، ئازارو ئەشکەنجەی شەڕخوازان .. وە دوژمنانی موسوڵمانانیش تێی بڕوانن تا بترسێن و سڵبکەنەوەو باش بزانن کە ئەوە کێیە لەگەڵی بەشەڕدێن و چۆن وا خۆیان دەخەنە بەر گورزە توندەکانیەوە کاتێ کە بەو شێوەیە بەرەنگاری موسوڵمانان دەبنەوە.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆلای ئەوانەی خواو باوەڕداران هەڵئەخەڵەتێنن بەوەی کە دەڵێن : آمنا بالله وباليوم الاخر . واشدەزانن کە گوایە زۆر زیرەك و دانان .. بەڵام ئای لەم گاڵتەجاڕیە! ئای لەو گاڵتە پێکردنەی بەسەریاندا دەبارێ بەرلەکۆتایی هاتنی ئایەتەکە : ﴿ وما يخدعون الا انفسهم ومايشعرون﴾ ..

ئەوانە ئەوەندە بێئاگان کە بەبێ ئەوەی هەستی پێبکەن ، بەتەنها هەر خۆیان هەڵدەخەڵەتێنن و خوای گەورە بەو فێڵەیان دەزانێت و، موسوڵمانانی پەنای خوای گەورەش هەر ئەو دەیانپارێزێ لەئەنجامی ئەو فێڵە پووچ و

نەگریسانە ، کەچی ئەو گەلۆرو بێئاگایانە تەنها خۆیان هەڵدەخەڵەتێنن و فێڵ لەخۆیان ئەکەن ، فێڵ لەخۆیان دەکەن کاتێك وائەزانن بەم دووڕوویەیان قازانجیان کردوەو وادەزانن خۆیان پاراستوە لە ئاشکراکردنی کوفرو بێباوەڕیان لەناو موسوڵماناندا . لەهەمان کاتیشدا خۆیان بەرەو هەڵدێر دەبەن بەوەی کە بێباوەڕیەکەیان دەشارنەوەو دووڕوویی دەردەخەن وبەرەو کۆتاییەکی ئێجگار دژواریش دەچن !

ئەی باشە بۆچی دووڕوان ئەم هەوڵە دەدەن ؟ ئەی ئەم فڕوفێڵەیان لەچی ؟

﴿ في قلوبهم مرض ﴾ .. دڵیان نەخۆشەو.. سروشتیان خۆرە لێی داوە ، ئەمەش وایان لێدەکات لەو ڕێیە ڕاست و ڕوونە لابدەن و وا لەخۆیان ئەکەن خوای گەورە کێشەکەیان خراپتربکات ..

﴿ فزادهم الله مرضا﴾ .. نەخۆشیش ناساغیی تری لەدوایە ، لادانیش لەکەمەوە دەست پێ ئەکات و لەهەر هەنگاوێکیشدا وردە وردە کەنارگیریەکەی گەورەتر دەبێت . ئەمە یاسایەکی نەگۆڕە . یاسای خوای گەورەیە لەهەلومەرج و لەشتەکانیشدا ، لەهەست و لە ئاکاریشدا . کەواتە ئەوانە بەرەو داهاتوویەکی زانراو ئەڕۆن ، داهاتوویەك شایانی ئەو کەسانەیە کە فێڵ لەگەڵ خواو لەگەڵ موسوڵماناندا دەکەن : ﴿ ولهم عذاب أليم بما كانوا يكذبون ﴾ ..

یەکێك لەسیفەتەکانی تریان ــ بەتایبەتی پیاوە گەورەکانیان، ئەوانەی لەسەرەتای کۆچکردندا پلەوپایەی تایبەتی و دەسەڵات و سەرکردایەتیان لەدەستدابوو، وەك عەبدوڵای کوڕی سەلول ــــ سیفەتی سووربوون و پێداگرتن و پاساودانی ئەو خراپەکاریانەی دەیانگێڕاو لەخۆبایی بوونیان بوو دوای ئەوەی لەسزای تاوانەکانیان دەربازیان دەبوو !

﴿ واذا قيل لهم لاتفسدوا في الارض ﴾ .. گەر پێشیان بوترایە ئەو نەگریسی و بەد ڕەفتاریەتان لەچیە ؟ وەڵامیان هەر ئەوەنەبوو کە سیفەتی بەدڕەفتاری لەخۆیان دوور بخەنەوە ، بەڵکو بڕوبیانووی خۆبەباشزانیشیان دەهێنایەوە : ﴿ قالوا: إنما نحن مصلحون ﴾ ..

ئەو کەسانەی ناشرینترین و نابەجێترین خراپە ڕەوشتیانە و ، دەشڵێن : ئێمە چاکسازین ، نمونەیان گەلێك زۆرە لەهەموو سەردەمێکدا . بۆیە وا ئەڵێن چونکە پێوەری کردەوەکان لاسەنگ و شێواوە لای ئەوان ، وە هەرکاتێك پێوەرەکانی دڵسۆزی وپاکژی لەدەروونـدا تێکچوو ئیتر هەموو پێوانەو بەهاکانی تریش بەدوایاندا تێکدەچن . ئەوانەش کە لەدڵەوە لەگەڵ خوادا پاك نین ئەستەمە هەست بە نەگریسی و خراپەکاری خۆیان بکەن . چونکە پێوانەی چاکەو خراپە و چاکسازی و بەدکاری لەناو دەروونیاندا لەگەڵ ئارەزووەکانیاندا دێ و دەچێ و لەسەر بناغەیەکی خوایی خاوێن لەنگەر ناگرێ .

پاشان ئەم بەدواداچوون و بڕیارە جەرگ بڕە بەرەوڕوویان دەبێتەوە :﴿ الا إنهم هم المفسدون ، ولكن لايشعرون ﴾ ..

ڕەوشتێکی دیکەیان زمان درێژیو خۆبەگەورەزانینە بەرامبەر خەڵکیی ، تالەبەرچاویان پلەو پایەیەکی درۆینەی فشەڵ بەدەست بێنن : ﴿ وإذا قيل لهم : امنوا كما امن الناس ، قالوا: أنؤمن كما آمن السفهاء ؟ الا انهم هم السفهاء ولكن لايعلمون ﴾ .

ئاشکرایە ئەو بانگەوازەی دەکران لەشاری مەدینەدا ، داوای بیروباوەڕێکی پاك و بێگەردی ڕاست و دروست و دوور لە ئارەزووە پووچەڵەکانی لێدەکردن ، باوەڕێك وەك ئەوەی ئەو خەڵکە دڵسۆزانە بەهەموو هەست و نەستێکیان باوەڕیان پیاکردبوو ، ڕووی خۆیان کردبوە لای خوای گەورەو بالأدەست و سینەو دەروونیان بۆ پێغەمبەری خوا کردبۆوە (ﷺ) ،

چـۆن ئاڕاسـتەی بکردنایـە بەوپـەڕی دڵـسۆزی و توانـاو لەخۆبووردنـەوە گوێڕایەڵی ئەبوون . ئەمانە ئەو کەسانەبوون کە دووڕووان بانگ دەکران تاوەك ئەوان باوەڕێکی پاك و تەواوو بێگەرد و ڕاست و بێگرێیان هەبێت .

وادیـارە ئەوانـە لـە خۆبەدەسـتەوەدانیادا لـووت بـەرزیان دەنوانـد لەگـەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) ، وایان دائەنا کە ئەم کێشەیە تایبەتە بەخـەڵکێکی هـەژارو کـەم دەسـەڵاتەوە و شـایانی ئـەمانی گـەورە پیـاوان نیـە ! بۆیـە دەیـانگووت: ﴿انؤمن کما آمـن الـسفهاء ﴾ .. ئیتر ئەوەبوو ئابەم بڕیـارە توندوتیـژو بـەهێزە لەدەمیان درایەوە : ﴿ الا إنهم هم السفهاء ولکن لایعلمون ﴾ ..

جا کەی گەلحۆی نەزان زانیوێتی کەخۆی گـەلۆرو نەزانە ؟! کـەی مرۆڤـی خوارو خێچ هەست بەدووری و لادانی خۆی دەکات لە ڕاستەڕێ ؟!

پاشان دوا ڕەوشتیان باسدەکات ، وە پەردە لەسەر ئەو پەیوەندیەی نێوان دووڕووانی مەدینەو جولەکە داخ لەدڵەکاندا هەڵدەداتەوە . ئەوانەی لەسنووری درۆکـردن و فروفێـڵ و گـەلۆری و بڕوبیـانوودا ناوەسـتن ، بـەڵکو نەگریـسی و کەمدەسـەڵاتیی و پـیلان گێڕیـی لەتاریکیـدا دەخەنەسـەر بەدکاریـەکانی تریشیان ..

﴿ واذا لقوا الذین آمنوا ، قالوا: آمنـا، وإذا خلـوا الی شـیاطینهم قالوا: إنـا معکـم ، إنمـا نحـن مـستهزئون ﴾.. هەنـدێ کـەس بـەدکاری و خراپەویـستی بەئازایـەتی و دەسـڕۆیی دادەنـێ ، پیلان گێـڕی بـەلێهاتوویی دەزانـێ . بـەڵام لەڕاستیدا بێدەسـەڵاتی و کـەم نرخیـە ، چونکە پیـاوی بـەهێزو ئـازاو نـەترس هـەرگیز نـەگریس و دڵ پـیس نیـە و، پـیلان گێـڕو فـێڵاوی و بـەدڕفتار نیـە و لـەژێرەوە دووزمـانی ناکـاو تـوانج و پـلار ناهـاوێ . وە ئـەو دووڕووانـەی کـە خۆیـان لـە ڕووبەڕووبوونـەوە لەگـەڵ موسـوڵماناندا لائـەداو لەبەردەمیانـدا بـە موسوڵمان خۆیـان پیشان ئەدا ، تـا خۆیان لە ڕیسوایی و ئازارو ئەشکەنجە بپـارێزن و، ئـەم ڕوودابۆشـین و خۆشاردنەوەشـیان کردبـووە هۆکارێـك بـۆ

ئازاردانی موسوڵمانان .. هەر ئەمانیش گەر تەنیابوونیانە لەگەڵ سەرانیاندا ـ کەزۆر جار ـ ئەو جولەکانەبوون کە ئەم دووڕووانەیان دەکردە داردەستی خۆیان بۆ تێکدان و پەرتکردنی ڕیزی موسوڵمانان ، هەروەها دووڕووانیش جوەکانیان کردبووە پاڵپشت و پەنای خۆیان .. ئەو دووڕووانە ﴿ إذا خلوا الى شياطينهم قالوا: إنا معكم إنما نحن مستهزئون ﴾ دەیانووت خۆ ئێمە لەگەڵ ئێوەداین و گاڵتە بە وان دەکەین ـ یانی بە موسوڵمانەکان ـ بەوەی کە باوەڕهێنان و ئیسلام بوونی ڕواڵەتیی خۆمانیان پیشان ئەدەین ! بەڵام قورئان هەر کە باسی ئەو ڕەفتارو ووتانەیان دەکات ، ئیتر هەڕەشەیەکی وایان ئاراستە دەکات کە پایەو بناغەیان لەبنەوە هەڵبوەشێنێ :

﴿ الله يستهزء بهم ، ويمدهم في طغيانهم يعمهون ﴾ ..

دەسا قوڕ بەسەر ئەو کەسەی خوای بالآدەستی زەوی و ئاسمانەکان گاڵتەی پێ دەکا و خاك بەدامانی!! وەکاتێ کە قورئان ئەفەرموێ :﴿ الله يستهزئ بهم ويمدهم في طغيانهم يعمهون ﴾ .. خەیاڵ و ئەندێشە بەرەو وێنەیەکی نمایشکراوی ترسناك و تۆقێنەر دەڕوات ، بەرەو چارەنووسێك کەدڵ ئەخاتە لەرزەو تەزوو بەلەشدا دێنێت . وازیان لێ دێنێت تا لەڕێگایەکی بێئاکامدا بگەوزێن و نەزانن بەرەو کوێ دەیانبات و، دەست و هێزێکی بەتواناو دەسەڵاتیش لەکۆتایی ڕێگاکەدا لوولیان ئەداو ئەیانپێچێتەوە ، هەروەك مشکە لاوازەکانی ناو تەڵەیەکی تەقیو هەڵبەزوو دابەزیانەو، بێئاگان لەدەرگای توندوپتەوی تەڵەکەیان .. ئائەوەیە گاڵتەپێکردنی سامناك، نەك وەك گاڵتەپێکردنە ساکارو بێ ماناکانی ئەوان ئەیانکرد بەرامبەر موسوڵمانەکان .

هەر لێرەدا ئەو ڕاستیە دەردەکەوێ کەلەمەوپێش ئاماژەمان بۆکرد . ڕاستی پشتگیری کردنی خوای مەزن ـ سبحانە ـ بۆئەو بەگژاچوونەی بەرامبەر موسوڵمانان دەکرێو لەپشت ئەم پشتگیریەشەوە دڵنیاییەکی تەواو

هەیە بۆ لایەنگرانی خواو، چ چارەنوسێکی تۆقێنەری قێزەون چاوەڕێی دوژمنە بێئاگاکانی خوای گەورە دەکات ، ئەوانەی وازیان لێهێنراوە تا لەکوێری و لەتاریکستاندا بگەوزێن ، ئەوانەی بەوە هەڵخەڵەتاون کە خوای مەزن بۆماوەیەکی کەم بواری سنووربەزاندن و ملهوڕیی داون و پشت گوێی خستوون ، کەچارەنووسێکی ترسناك و خراپیش چاوەڕێیان دەکات بەڵام ئەمان خۆیان نابیناو بێئاگاو سەرلێشێواون !

دوا وتەش ڕاستیی بارودۆخیان ئەنوێنێ کەوا چەند کەساس و دۆڕاون : ﴿ اولئك الذين إشتروا الضلالة بالهدى ، فما ربحت تجارتهم وما كانوا مهتدين ﴾ .. خۆ ئەیانتوانی بەرەو ڕێنمایی بڕۆن و دوای بکەون . چونکە ئەو ڕێنمایە ئاسان و نزیکەدەست بوو بۆیان ، بەڵام ﴿ إشتروا الضلالة بالهدى ﴾ ، وەك بێئاگاترین و گێلترین بازرگانەکان :

﴿ فما ربحت تجارتهم وماكانوا مهتدين ﴾ ..

وا هەست دەکرێ کە ئەو پانتاییەی وێنەی سێیەمی تیاکێشراوە فراوانتربێت لەو ڕووبەرەی وێنەی یەکەم و دوەمی گرتۆتەخۆ .. ئەمەش لەبەرئەوەیە کە هەردوو وێنەی یەکەم و دوەم جۆرە ڕاستیەکیان تیایەو چەشنە سادەییەکی پێوەدیارە .. وێنەی یەکەم وێنەی دەروونێکی پاکی ڕاست و ڕەوان و بێگرێ دەکێشێ و، دوەمیش وێنەی دەروونێکی تاریکی تەڵخی سەرلێشێواو . بەڵام وێنەی سێیەمین هی دەرونێکی بەپێچ و پەنای نەخۆشی ئاڵۆزەو دڵەڕاوکێی لێدەڕژێ ، کەپێویستی بەدەستکاریکردنێکی زیاترو هێڵ و هێمای زیاترە تا باش بناسرێ و ڕونتر سیماکانی دەربکەوێ..

بەڵام ئەم درێژەدانە بەوجۆرە وێنانە گەورەیی و ترسناکی ئەو ڕۆڵە دەردەخات کە دووڕووان ئەیانگێڕا لەشاری مەدینەدا بۆ ئازاردانی کۆمەڵەی موسوڵمان و ئەو هەموو ماندوویی و گێرەشێوێنی و نائارامیەی کە دەیانننایەوە ، هەروەها گەورەیی ئەو ڕۆڵە پیشان ئەدات کە دووڕووان دەتوانن

لەهەرکاتێکدا بیگێڕن لەناو ڕیزی موسوڵماناندا ، تابزانری چەند پێویستە پەردە لەسەر پیلان و فڕوفێڵە نابەجێ و نەگریسەکانیان هەڵبماڵرێ . وە بۆزیاتر ڕوونکردنەوە ، ڕەوتەکە بەردەوام دەبێ و چەند نمونەیەکی تری ئەم دەستەیە دیاری دەکاو سروشتی هەڵگەڕانەوەو ناچەسپاویان ئاشکرا دەکات تا زۆر بەباشی و بەجوانی بناسرێن .

﴿ مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ ٱلَّذِى ٱسْتَوْقَدَ نَارًا فَلَمَّآ أَضَآءَتْ مَا حَوْلَهُۥ ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمْ وَتَرَكَهُمْ فِى ظُلُمَٰتٍ لَّا يُبْصِرُونَ ﴿١٧﴾ صُمٌّۢ بُكْمٌ عُمْىٌ فَهُمْ لَا يَرْجِعُونَ ﴿١٨﴾ ﴾
البقرة: ١٧ ـ ١٨

ئەوانە هەر لەیەکەم ساتەوە پشتیان نەکردە ڕێنمایی و گوێی خۆیان گران نەکرد لەبیستنی و، چاویان لەدیتنی نەقوچان و، دڵیان بۆ تێگەیشتنی دانەخست ، وەك کافرە بێباوەڕەکان کردیان . بەڵام دوای ئەوەی بابەت و کێشەکەیان باش بۆ ڕوون بووەوە کەچی پاشان کوێرەوەریان لەڕێنمایی پێباشتربوو.. ئاگرێکیان کردەوەو خۆشیان کرد ، کاتێ ڕوناکی پێبەخشین کەڵکیان لێ وەرنەگرت ، گەرچی خۆشیان ویستبوویان ، بۆیە خوای گەورە ئالەوکاتەدا : ﴿ ذهب الله بنورهم ﴾ ئەوەی کە هەرخۆیان ویستیان و وازیشیان لێهێنا: ﴿ وترکهم في ظلمات لایبصرون ﴾ ..لە ناو ئەو تاریکیانەدا بە جێی هێشتن .. لەسزای پشتکردنیان لەو ڕوناکی و ڕۆشناییە پەخش کراوەدا !

جا گەر گوێ و زمان و چاوەکان بۆ وەرگرتنی دەنگ و ڕووناکی بێت و بۆ سوود وەرگرتن بێت لە ڕۆشنایی و ڕێنمایی، ئەوا ئەوان گوێی خۆیان پەکخستوە بۆیە ﴿ صم﴾ کەڕن بوون و، زمانیان لەکارخستبوو بۆیە ﴿بکم﴾ لاڵن و چاویشیان نووقاندبوو بۆیە ﴿ عمی﴾ کوێرن .. هەر لەبەرئەوەشە کە چیتر ناگەڕێنەوە بەرەو حەق و ڕاستی و ناگەڕێنەوە بەرەو ڕێنمایی و دەستیان ناگیرێ بەرەو ڕۆشنایی و ڕووناکی ! نمونەیەکی تریش وێنەی بارودۆخیان دەکێشێ و ئەو تێکچوون و دڵەڕاوکێ و سەرگەردانی و مەترسیەی دەروونیان تێیکەوتووە دەستنیشان دەکات :

﴿ أَوْ كَصَيِّبٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فِيهِ ظُلُمَٰتٌ وَرَعْدٌ وَبَرْقٌ يَجْعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمْ فِىٓ ءَاذَانِهِم مِّنَ ٱلصَّوَٰعِقِ حَذَرَ ٱلْمَوْتِ ۚ وَٱللَّهُ مُحِيطٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٩﴾ يَكَادُ ٱلْبَرْقُ يَخْطَفُ أَبْصَٰرَهُمْ ۖ كُلَّمَآ أَضَآءَ لَهُم مَّشَوْا۟ فِيهِ وَإِذَآ أَظْلَمَ عَلَيْهِمْ قَامُوا۟ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَذَهَبَ بِسَمْعِهِمْ وَأَبْصَٰرِهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٠﴾ ﴾ البقرة: ١٩ - ٢٠

دیمەنێکی سەیرە ، هەمووی هەر جوڵەو بزاڤتنە ، تێکەڵە بەتێکچوونێکی نالەبارو گومڕایی و لێشێوان و ترس و لەرزو ، داچڵەکان و سەرگەردانی و، ڕوناکی و دەنگدانەوە .. بارانێکی زۆر بەخوڕ لەئاسمانەوە دێتەخوارێ ﴿ فيه ظلمات ورعد وبرق ﴾ .. ﴿كلما اضاء لهم مشوا فيه﴾ ..﴿واذا اظلم عليهم قاموا﴾. واتە بەوسەرلێشێواویەوە ڕاوەستاون و گیریان خواردوەو خۆشیان نازانن بەرەو کوێ ئەچن . زۆریش ئەترسن : ﴿يجعلون أصابعهم في آذانهم من الصواعق حذر الموت ﴾ ..

وە ئەو جوڵەیەی کە هەموو دیمەنەکەی داگیرکردوە : بارانی بەخوڕو ، تاریکی و هەورە گرمەو بروسکەو، ئەو خەڵکە سەرگەردانە ترسنۆکەو، ئەو هەنگاوە لەرزۆکانەی کاتێ تاریکی دادێت ئەچەقێ و ڕادەوەستێ .. ئەم هەموو جوڵەیە لەو دیمەنەدا ـ بەهۆی کاریگەرە سروشت ئامێزەکەیەوە ـ وێنەی ئەو سەرگەردانی و سەرلێشێوان و دڵەڕاوکێ و گومانە ئەکێشێ کە ئەو دووڕوانە تیایدا دەژین .. لەنێوان چوونیان بۆلای موسوڵمانەکان و گەڕانەوەیان بۆلای سەرانیان ـ کە بەشەیتانەکانیان ناویان دەبات ـ لەنێوان ئەو وتانەی کە دەیڵێن و پاشان کت و پڕ لێی پەشیمان ئەبنەوە ، لەنێوان ئەو ڕێنمایی و ڕوناکیەی ئەیانەوێ و ئەو گومڕایی و تاریکیەی لەپاڵیا دەحەوێنەوە .. ئەمە دیمەنێکی هەستیارە ، ئاماژە بۆ بارێکی دەروونیی

دەکات و، وێنەیەکی ناو هەست و دەرونیان بەرجەستە دەکات . ئەوەش چەکێکە لەو ڕێبازە سەیرەی قورئان ئەیگرێتەبەر کاتێ کە بەرجەستەی بارە دەروونیەکان دەکات هەروەك بڵێی دیمەنێکی هەستپێکراوی زیندوە[1] ...

پاش نمایش کردنی هەرسێ وێنەکەو تەواوبوونیان ڕەوتی سورەتەکە دەگەڕێتەوە سەر بانگەشەی هەموو خەڵکی و فەرمانکردن بەهەموو مرۆڤایەتی کە وێنە ڕاست و ڕەوان و پڕ سەرفرازیەکە هەڵبژێرن ، وێنە کارامە سوودبەخشەکە . وێنە ڕێ پۆشن و سەرکەوتوەکە ، کەوێنەی موسوڵمانە لەخوا ترسەکانە :

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ۝٢١ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فِرَٰشٗا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءٗ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزۡقٗا لَّكُمۡۖ فَلَا تَجۡعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادٗا وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ۝٢٢ ﴾ البقرة: ٢١ - ٢٢

ئەمە بانگەوازێکە بۆسەرجەم ئادەمیزاد تا ئەو پەروەردگارە بپەرستن کە ئەوان و خەڵکەکانی پێش ئەوانیشی بەدیهێناوە .. ئەو پەروەردگارەی کە هەرخۆی بەتەنیا بەدیهێنەرە ، بۆیە پێویستە هەر ئەو بپەرسترێت .. پەرستنیش ئامانجێکی تایبەتی هەیە بەڵکو بیکەنێ و جێبەجێی بکەن :

﴿ لعلكم تتقون ﴾ .. تا ئەنجامتان وەك ئەو نمونە هەڵبـژێردراوەی مرۆڤایەتی بێت ، کە نمونەی خوا پەرستان و لەخوا ترسانە . ئەوانەی

---

[1] بڕوانە بەشی (التحليل الحسي والتجسيم) لە کتێبی (التصوير الفني في القرآن)–دار الشروق .

بەتەواوی مافی پەروەردگاریی بەدیهێنەریان گەیاندوەو بەجێ هێناوە ، تەنها ئەو بەدیهێنەرەیان پەرستوە ، کە پەروەردگاری مرۆیانی ئێستاو ڕابوردووشە ، بەڵکو پەروەردگاری هەموو ئادەمیانە ، وە بەبێ هیچ هاوتاو هاوبەشێك ڕۆزییان ئەدات لەزەوی و لەئاسمانەکانیشدا: ﴿ الذي جعل لكم الأرض فراشا﴾..

ئەمە گوزارشێکە ڕاستەوخۆ مانای خۆشگوزەرانی پەخش دەکات لەژیانی مرۆڤی سەرئەم زەویەدا، بەو پێویستیانەی بۆی ئامادەکراوە، تابێتە جێی حەوانەوەیەکی خۆش و پەنایەکی پارێزەر، کەوەك ناوجێ و پێخەف وابێت .. بەلام خەڵکیی بەهرەی ئەم ناوجێ و پێخەفە ناوازەیان لەگەڵ ڕۆژگارداو لەئەنجامی خوو پێوەگرتندا لەبیرئەکەن ، ئەو راستیە لەبیردەکەن کە خوای گەورە خۆی بۆی ڕاخستوون . ئەو ڕێك و پێکی و گونجانەیان لەبیردەچێتەوە کە خوای بەخشندە بۆی ڕەخساندوون لەسەر ئەم زەویە تا پێداویستیەکانی ژیانیان بۆبەردەست و سانابێت .. هۆکارەکانی خۆشگوزەرانی و حەوانەوەیان لەبەرچاو بزر ئەبێ ، خۆ ئەگەر ئەم ریکخستن و گونجانە نەبوایە ژیانی ئەمانیش لەسەر ئەم ئەستێرەیە دەستی پێنەدەکرد بەم شێوازە لەبارو ئاسانە . گەر تەنها یەکێك لە توخمەکانی ژیان لەسەر ئەم ئەستێرەیە بزر بوایە یا نەمابایە ئەوا هیچ کام لەو خەڵکانە نەیاندەتوانی لەژینگەو جێگەیەکی دیکەدا ژیان ببەنە سەر، گەر تەنها یەکێك لە توخمەکانی هەوا لەڕێژەی دیاری کراوی خۆی کەمتربوایە زۆر ئەستەم ئەبوو بەم شێوەیەی ئێستا هەناسەیان بۆبدرێ ئەگەر ژیانیشیان بۆ بڕەخسایە !

﴿ والسماء بناءا ﴾ .. پتەویی بیناو ڕێك و پێکی بیناسازی تیایە ، ئاسمان پەیوەندیەکی بەتوندی هەیە بەژیانی مرۆڤەوە لەسەر زەوی ، کە پەیوەندی بە ئاسان بوونی ژیانەوە هەیە . ئەم ئاسمانە بەو گەرمایی و ڕوناکی و بەهێزی ڕاکێشانی هەسارەکان وگونجانیان و سازدانیان و هەموو

ئەو پەیوەندیانەی لەنێوان ئاسمان و زەویدا هەیە ، ئەمانە هەمووی دیاردەی بەرپابوون و بەردەوام بوونی ژیان و گوزەران دەگەیەنێت لەسەر ئەم زەویە . بۆیە هیچ سەیر نیە گەر باسبکرێت هاوکات لەگەڵ باسکردنی توانای خوای بەدیهێنەرو بەخشندەو ڕۆزیدەر و لەگەڵ لێوەشاوەیی خوای پەرستراو بۆ ئەرکی پەرستن لەلایەن ئەو بەندە دروست کراوانەیەوە .

﴿ وانزل من السماء ماءا ، فأخرج به من الثمرات رزقا لكم ﴾ ..

باسکردن لەهێنانەخوارەوەی ئاو لە ئاسمانەوەو بەرهەم هێنانی بەروبومێکی زۆرو بەردەوام بەهۆی ئەم ئاوەوە ، چەندین جارو لەچەندین شێوەدا دووبارە ئەبێتەوە ، لەوکاتانەی کە توانایی و دەسەڵات و نازو بەهرەکانی خوای گەورە بەبیربهێنرێتەوە .. ئەوئاوەی لەئاسمانەوە دێتەخوارێ بریتیە لە گرنگترین توخمەکانی ژیانی هەموو زیندەوەرانی سەرگۆی زەوی . هەر لەئاوەوە ژیان و زیندەیی بەگشت شێوەو پلەکانیەوە دەستی پێکرد ﴿ وجعلنا من الماء كل شئ حي﴾ .. ئیتر چ پاش تێکەڵ بوونی بەخاکی سەرزەوی کە ڕاستەوخۆ ڕوەکێکی پێ ڕوا ، یاخود پاش دروست بوونی ڕووبارو دەریاچە شیرینەکان ، یا بەناخی چینەکانی زەویدا ڕۆبچێ و ئاوە قووڵەکانی ژێر زەوی لێ پێك بێت ، کە ئەمانیش کانیاوەکانیان لێوە هەڵدەقوڵێ یا بیریان لێ هەڵدەکەنرێ ، یاخود بە ئامێری تایبەت جارێکی تر بهێنرێنەوە سەرزەوی .

بەسەرهاتی ئاو لەسەر زەویو ، ڕۆڵی لەژیانی خەڵکیداو، بایەخی بۆ زیندەوەران بەهەموو وێنەو شێوەکانیەوە .. ڕاستیەکە چەندو چۆنی ناوێ ، بۆیە لەوکاتانەی کە بانگەواز دەکرێت بۆ پەرستنی خوای بەدیهێنەرو ڕۆزی دەری بەخشندە ، تەنها ئاماژە پێکردن و بیرهێنانەوە بەسە بۆئەوەی ئەوڕاستیانە بچەسپێن .

لەو بانگەوازەدا دوو هێڵی گشتی لەهێڵە سەرەکیەکانی بۆچوونی ئیسلامی بەئاشکرایی دەرئەکەوێت: یەکێتی بەدیهێنەری هەموو بوونەوەران : ﴿ الذي خلقكم والذين من قبلكم ﴾ وە یەکێتی گەردوون و گونجانی پێکهاتەکانی و دۆستیی و ئاشنایی بۆژیان و بۆ مرۆڤیش : ﴿ الذي جعل لكم الأرض فراشا والسماء بناءا وانزل من السماء ماء فأخرج به من الثمرات رزقاً لكم ﴾ .. ئەم گەردوونە ، زەویەکەی ڕاخراوە بۆئەم مرۆڤەو، ئاسمانەکەی بەپێی یاسایەك بنیات نراوەو، بەئاوێك پاراوکراوە کە بەروبووم و ڕۆزی خەڵکی پێ مسۆگەر بکرێ و.. چاکەی ئەمانەش هەمووی هەر بۆ تەنها بەدیهێنەرێك دەگەڕێتەوە :﴿ فلا تجعلوا لله انداداً وانتم تعلمون ﴾ ..

خۆتان باش ئەزانن ئەوخوایە بەدیهێنەری ئێوەو خەڵکانی پێش ئێوەشە ، دەشزانن کە ئەم زەویەی کردۆتە ڕایەخێك و ئاسمانیش بنیادێك و لەو ئاسمانەوە ئاوێکی زۆری ناردۆتە خوارێ و هیچ هاوبەشێکی نەبوە یاریدەری بێت و، هیچ دوژمنێکیشی نەبوە بەرهەڵستی بکات . بۆیە هاوبەش پەیدا کردن بۆ ئەوخوا بێ هاوتایە دوای ئەو هەموو ناسین و بەهرانە ڕەفتارێکی نەشیاو و نەگونجاوە !

ئەو هاوتایانەی قورئان زۆر بەتوندی فەرمان بە نەویستنیان دەکات و فەرمان بەپشت تێکردنیان دەکات ، تا عەقیدەو باوەڕی یەکخواپەرستی بەپاکی و ڕوونی بمێنێتەوە ، خۆ ئەوانە مەرج نیە خواوەندێك بن هاوشان لەگەڵ خوای گەورەدا بپەرسترێن بەوشێوە ساویلکانەی هاوبەش پەیداکاران دەیان پەرست . لەوانەیە هاوتاکان لەچەند نمونەیەکی شاراوەدابن . یا لەشێوەیەك لە شێوەکانی داواکردنی کۆمەك و یارمەتیدا بێت لەهێزێکی دی جگە لە خوای مەزن . یاخود باوەڕبوون بە هەرشێوازێك لەسوودگەیاندن یا زیان گەیاندن بێت جگە لەخوای گەورە . (ابن عباس) ئەفەرموێت : { الأنداد هو الشرك . أخفى من دبيب النمل على صفاة سوداء في ظلمة الليل. هو أن

يقول : والله وحياتك يافلان وحياتي . ويقول : لولاكلبة هذا لأتانا اللوص البارحة ، ولولا البط في الدار لأتى اللصوص . وقول الرجل لصاحبه ماشاءالله وشئت ! وقول الرجل : لولا الله وفلان ، هذا كله شرك } .. له فەرموودەيەكيشدا هاتووە كە پياوێك بەپێغەمبەری ووت (ﷺ) ماشاءالله وشئت . قال : (اجعلتني اندادا ؟) !

ئابەم شێوەیە پێشینانی ئەم نەتەوەیە سەیری هاوبەشپەیداکردنی نهێنی و هاوتا دانانیان بۆخوای گەورەکردوە .. دەبا ئێمەش سەیرێکی خۆمان بکەین و بزانین چ هەڵوێستێکمان هەیە لەگەڵ ئەو هەستە وردو ناسکانەداو ، بزانین ئێمەو ڕاستیی یەکخوا پەرستی مەزن چەندو..... چەند لەیەك دوورین !!!

جوەکان گومانیان دەبرد بەڕاست و دروستیی پەیامەکەی پێغەمبەر (ﷺ) هەروەها دووڕووەکانیش هەمان گومانیان دەبرد ـــ وەك هاوبەش پەیداکەرانی شاری مەککەو جێیەکانی دیش ـ بەڵام لێرەدا قورئان بەرامبەر هەموویان ڕادەوەستێ ، چونکە بانگەواز بۆ سەرجەم ئادەمیزادە (الناس) . بەئەزموونێکی دروست و واقیعی بەرەو ڕوویان دەبێتەوە کەزۆر بەڕاشکاوی و بێگرێ کێشەکە یەکلا دەکاتەوە :

﴿ وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٢٣﴾ ﴾ البقرة: ٢٣

ئەم بەرەوڕووبوونەوەیە بەلاکردنەوەیەکی گرنگ دەست پێدەکات لەم بوارەدا .. پێغەمبەر (ﷺ) بەبەندەی خوا ناو دەبات ﴿وان كنتم في ريب مما نزلنا على عبدنا﴾ .. ئەم باسکردنە لەم جێیەدا چەند مانایەکی فرەلایەنەی تەواوی هەیە : یەکەمیان سەربەرزی و شکۆمەندیە بۆ پێغەمبەرو نزیك بوونەوەیەکیشە بەوەی کەناوی لەگەڵ بەندایەتی بۆخوای مەزن ناودەبرێ ،

بەڵگەیەکە کەپایەی بەندایەتی بۆخوای گەورە بڵندترین و پیرۆزترین پلەو پایەیە کە مرۆڤی بۆ بانگەشە بکرێت و بەو سیفەتە ناوی ببرێت . دوەمیش دان پیانان و چەسپاندنی مانای بەندایەتیە لەو بوارەیدا کەسەرجەم خەڵکی بانگەواز دەکرێن بۆ پەرستنی تاکە پەوەردگاریان و هەرچی و هەرجۆرە هاوتایەك هەیە فڕێ بدرێ و بسڕێنەوە . ئەوەتا ئەبینن کە پێغەمبەر لەپلەی سرووشدا ـ کەبەرزترین پلەیە ـ ناوببرێت بە بەندایەتی بۆ خوای گەورەو، بەم بەندایەتیەشی پلەوپایەو نرخی بڵندترو رێزدارتر دەبێت .

بۆئەم بەرەوڕووبوونەوەیە ئەڕوانرێتە سەرەتای سورەتەکە .. ئەم پەڕتووکە نێردراوە لەهەمان ئەو پیتانە دارێژراون کە دەیزانن و لەبەردەستیاندایە ، جا گەر گومانیان لەهاتنەخوارەوەی هەیە ، با سوورەتێکی وەك ئەو دابرێژن و، جگە لەخوای گەورە خەڵکانێك بانگ بکەن بۆ گەواهیدان لەو کێشەیەدا ـ چونکە خوا گەواهی خۆی بۆ ڕاستگۆیی بەندەکەی خۆی داوە لە بانگەوازەکەیدا ـ !

ئەم بەرەنگاریە تا پێغەمبەر (ﷺ) لەژیانیدا مابوو هەربەردەوام بوو ، بۆ پاش ئەویش هەروا بوو تاڕۆژگاری ئەمڕۆش هەرماوە . هەربەردەوامەو بەڵگەیەکە کە بەهیچ جۆرێك گومان و بێنەو بردەی لەگەڵدا ناکرێ . هەتا ئێستاش قورئانی پیرۆز لەهەر وتەیەکی مرۆیی جوداترەو تایبەتمەندیەکی ڕوون و ئاشکرای گومانبڕی هەیە و هەتا هەتایە هەروا ئەمێنێتەوەو دەبێتە بەڵگەی ڕاستگۆیی خوای مەزن و بالادەست لەو ئایەتەدا.

﴿ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ وَلَن تَفْعَلُواْ فَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِى وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾ البقرة: ٢٤

بەرەنگاریەکە لێرەدا زۆر سەرسوڕهێنەرەو، سوور بوونیش لەسەر نەتوانینی سەیرترە .. گەر لەتواناادا بوایە بەدرۆی بخەنەوە هەرگیز کەمتەرخەمیان نەدەکرد ، گومانیش لەوەدا نیە کە قورئانی پیرۆز ئەڵێ هەرگیز ناتوانن ئەوکارە ئەنجام بدەن ، کە ئەم بڕیاردانەشی هەرزوو هاتەدی و خۆی لەخۆیدا موعجیزەیەکە ناتوانرێ گومانی لێ بکرێ . خۆ گشت بوارەکانیشیان بۆ والأبوو ، جاگەر بیانتوانیایە ئەم داوایە هەڵبوەشێننەوە ئەوا ڕاستی و بەڵگەی قورئان پوچەڵ دەبوەوە ، بەلأم ئەنجامی کارەکە وانەبوو واش نابێت ، چونکە بانگەشەکە بۆهەموو خەڵکیەو، ئەگەرچی بۆ بەرپەرچ دانەوەی نەوەیەك لەنەوەکانی مرۆڤیش ئەنجامدرابێت ، ئیتر ئەمە خۆی بەتەنها وتەیەکی یەکلاکەرەوەی مێژوویيە .

بەلأم گەر کەسێك زاناو شارەزابێت لەشێوازەکانی دەربڕین و هەرکەسێ شارەزای بوونی مرۆڤ و بوونی شتەکان و ئەوانەی شارەزای یاساو بەرنامەو ئەو بیردۆزە دەروونیی یا کۆمەڵایەتیانەی کە ئادەمیزاد خۆیان دایان ئەڕێژن .. ئەو جۆرە کەسە هەرگیز گومان لەوە ناکات کە ئەوەی قورئان هێنای لەهەموو ئەو بوارانەدا شتێکی ترەو لەوشتانە نیە کە مرۆڤ خۆی بەرهەمیان دێنێ و دروستیان دەکات .. گومان بردن و بێبڕوایش لەم کێشەیەدا یا لەنەزانین و نەشارەزاییەوەیە ، یاخود لەنیازی خراپی تێکەڵ کردنی ڕاستی و ناڕاستیەکانەوە دێ .

پاشان ئەم هەڕەشە توندو جەرگبڕە دێتە گۆڕێ بۆ ئەوانەی کە دەستەپاچەن و هیچیان پێناکرێ ، کەچی لەم ڕووبەڕووبوونەوەیەشدا هەر باوەڕ بەوڕاستیە ڕوون و ئاشکرایە ناهێنن :

﴿ فاتقوا النار التي وقودها الناس والحجارة ، اعدت للكافرين ﴾..

ئایا دانانی ئادەمیزاد هاوکات لەگەڵ ئەو بەردە ڕەقانەدا لەیەك ڕیزو یەکخانەدا ، بۆ چ مەبەستێکە ؟ لەم وێنە سامناك و تۆقێنەرەدا ؟ ئەو ئاگرە سووتێنەرە ئامادەکراوە بۆ بێباوەڕان . ئەو بێباوەڕو کافرانەی کەلەسەرەتای سورەتەکەدا باسکراون : ﴿ ختم الله على قلوبهم وعلى سمعهم وعلى أبصارهم غشاوة ﴾ .. ئەوانەش کە قورئان لێرەدا بەرهەڵستیان دەبێ و بێدەسەلآت و دەسەپاچە ڕائەوەستن و، وەلآمیشیان پێنادرێتەوە.. کەواتە ئەوانە بەردێکی ڕەق و وشکی لەچەشنی ئەو بەردە بێگیانانەن ، با لەوێنە و ڕوخساریشدا لەشێوەی مرۆڤدابن ! چونکە ئەم خستنە یەك ڕیزو یەك ئاستەی ئەو بەردە ئاساییانەو ئەو مرۆڤانەی لەچەشنی بەردن ئەوکارەبوو کە چاوەڕوان ئەکرا !

بەلآم باس کردنی بەردەکان لێرەدا وێنەیەکی دی لەو دیمەنە سامناکە پیشانی دەروون ئەدات ، دیمەنی ئاگرێك کە ئەو بەردانە خۆراکێتی و، دیمەنی ئەو خەڵکانەی لەگەڵ ئەو بەردانەدا لەسەریەك کەڵەکەبوون و... لەو ئاگرە بەتینەدا ئەسووتێن ..

لەبەرامبەر ئەو دیمەنە ترسناکەشدا دیمەنێکی تری هاوتای ئەو نمایش ئەکات ، دیمەنی ئەو نازو خۆشیەی چاوەڕێی موسوڵمانە باوەڕدارەکان دەکات:

﴿وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ ۖ كُلَّمَا رُزِقُوا۟ مِنْهَا مِن ثَمَرَةٍ رِّزْقًا ۙ قَالُوا۟ هَـٰذَا ٱلَّذِى رُزِقْنَا مِن قَبْلُ ۖ وَأُتُوا۟ بِهِۦ مُتَشَـٰبِهًا ۖ وَلَهُمْ فِيهَآ أَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ ۖ وَهُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿٢٥﴾﴾ البقرة: ٢٥

**گەلێك زۆرن ئەو خۆشی و نازو بەهرانە ، بەڵام ئەوەی زیاتر سەرنج ڕاكێشە ـ جگە لەو ئافرەتە پاكژانە ـ ئەو بەروبوومە زۆرانەی لەیەكترئەچن ، ئەوەی كە وائەزانن لەمەوبەر بەشیان دراوە ، جا یاخود لەبەرهەمەكانی ژیانی دونیا ئەچێ ، كە هەر لەناوو شێوەیاندا وەك ئەوانن ، وەیاخود لەبەرهەمەكانی بەهەشتە كەلەوەو پێش پێیان دراوە ، لەوانەیە ئەو لەیەكچوونە ڕواڵەتیەو ئەو هەمە چەشنیە لەناوەرۆك و تام و بۆیەدا مەبەست بێت لەو باسكردنە كتوپڕەی كە هەموو جارێك دێتەئاراوە .. ئەمەش وێنەیەكی خەندەیی شیرین و خۆش مەزە ئەكێشێ و، مانای ڕەزامەندیەكی سەرتاپایی و، ڕووخۆشیەكی قەشەنگ پێشكەش دەكات لەگەڵ هەركتوپڕیەكی یەك لەدوای یەكدا و لەهەر جارێكیشدا لەو هاو وێنە ڕواڵەتیەدا شتێكی نوێ بەدەردەكەوێ !**

**ئەم هاوشێوەییە لە ڕوخسارداو ئەم جوانیە لەناوەرۆك و تام و بۆدا ، سیمایەكی ئاشكرایە لە دەستكردەكانی خوای مەزندا ، وا لەبوونەوەر دەكات لەڕاستیەكانیدا زۆر گەورەبێت . وەك لەوەی لەشێوە دەرەكیەكەیدا دیارە .. دەبا تەنها مرۆڤ بە نمونە وەربگرین كە ئەم ڕاستیە گەورەیە تیاڕەنگدەداتەوە ..**

مرۆڤــ هەموو هەر مرۆڤــن ، لەلایەنی شێوازی دروست بوونیانەوە : سەرولاشەو پەلەکان . گۆشت و خوێن و ئێسك و دەمارەکان . دووچاو و دووگوێ ودەم و زمان . خانەی زیندووی وەك یەك . پێکهاتەی هاووێنە لەشێوەو توخمەکاندا، بەلاّم ئەم لەیەکچوونە لەم شێوەو پێکهاتەیەیدا هەتاکوێ بڕدەکات ؟ ئەم هاووێنەییە لەسروشت و لە فەرماندا تاکوێ ؟ ئەو جیاوازیەی لەنێوان مرۆڤێك و مرۆڤێکی تردا هەیە ــ لەگەڵ ئەم هەموو لەیەکچوونەدا ـ ئەوەندەدوورە زۆرجاردەگاتە دووری نێوان زەوی و ئاسمان! !

ئەوەتا هەمەڕەنگیی لە دروستکراوەکانی خوای بەدیهێنەردا ئاوا دەرئەکەوێ ، ئەوەندە گەورەیە مرۆڤــ سەرسام دەکات ، هەمەڕەنگی لەجۆرو توخمەکاندا ، لەشێوەو سیماکاندا، لەسیفات و سرووشتدا.. هەمووش.. هەرهەمووی دەگەڕێتەوە سەریەك خانەی هاوشێوەو هاو پێکهاتە . ئیتر ئەوەکێبێ ئەو خوامەزن و تاك و تەنهایە نەپەرستێ کە ئەوە دەستکرە جوان و بێوێنەکانی بێت و نیشانە بەرزەکانی تواناو دەسەلاّتی بێ؟ ئەوە کێبێ هاوتا بۆخوای بێوێنە پەیدا بکات ؟ کە دەستی تواناو دەسەلاّتی بێسنووری ئاشکراو دیارە ، لەسەرجەم ئەو شتانەی چاو دەیانبینێ و ئەوانەش کە نایانبینێت ؟!

دوای ئەمانــە باســەکە دێتــە ســەر ئــەو پەنــدو نمونانــەی خــوای گــەورە دەیانهێنێتەوە لەقورئاندا :

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسْتَحْيِۦٓ أَن يَضْرِبَ مَثَلًا مَّا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا ۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ۖ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا ۘ يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا وَيَهْدِى بِهِۦ كَثِيرًا ۚ وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾ ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقْطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾
البقرة: ٢٦ - ٢٧

ئــەم ئایەتانــە وا دەردەخــەن کــە ئــەو دووڕوانــەی خــوای گــەورە ئــەو پەندانەیان بەنموونە بۆ دێنێتەوە وەك ئەوکەسەی ئاگرێکی کردبێتەوە یاخود ئەو ڕێژنەبارانەی کە لەئاسمانەوە دێتەخوارێ و پڕە لەهەورەگرمەو بروسك وتاریکی ـ کە لەوانەیە جوەکان و هاوبەش پەیداکارانیش هەروابووبن ـ ئەم پەندانە لەم بۆنانەدا باسکران و لەپەندەکانی تری نێو قورئانی مەککیشدا کە لــەوەوپێش هاتوونەتــە خــوارێ و لەمەدینەشــدا دەخوێنرانــەوە ، وەك ئــەو پەندەی خواکردی بەنموونەی ئەوانەی باوەڕیان بەپەروەردگاری بالآدەست نەبوو: ﴿ کمثل العنکبوت اتخذت بیتا وإن أوهن البیوت لبیت العنکبوت لوکانوا یعلمون ﴾.. یاخود ئەو پەندەی خوای گەورە کردیە نموونەی بێدەسەلآتیی خواوەندەکانیان لەدروستکردنی تەنها مێشێکدا: ﴿ إن الذین تدعون من دون الله لن یخلقوا ذبابا ولواجتمعوا له وإن یسلبهم الذباب شیئا لایستنقذوه منه . ضعف الطالب والمطلوب ﴾ ..

ئەڵێین: ئەم ئایەتانە وادەرئەخەن کە دووڕووەکان ـ لەوانەیە جولەکەو هاوبەش پەیداکارانیش ـ ئەم بۆنەیەیان کردە کەلەبەرێك بۆ گومان خستنە

سەر ڕاستگۆیی ئەم قورئانە ، کە گوایە پەند هێنانەوە بەم شێوەیە کە لەنرخی ئەمان کەم دەکاتەوە و گاڵتە پێکردنێکە بەوان، ئەم کارە لەخوا ناوەشێتەوەو ، خوای گەورە شتی وا بچووك و لاواز وەك مێش و جاڵجاڵۆکە باسناکات لەوتەکانیدا ! .. ئەمەش لایەنێك بوو لەو هێرشە گومان ئامێزەو گێرە شێوێنیەی دووڕوان و جوەکان دەیاننایەوە لەمەدینەدا، هەروەك چۆن هاوبەش پەیداکارانیش لەشاری مەککەدا دەیانکرد لەوەوپێش .

بۆیە ئەم ئایەتانە هاتنەخوارێ تا ئەم تۆمەتانە بەدرۆ بخاتەوە و ڕوونکردنەوەیەك بێت بۆ مەبەستی هێنانەوەی ئەو پەندانە لەلایەن خوای گەورەوەو، هۆشیارکردنەوەیەك بێت بۆ ئاکامی ئەم کردەوانە گەر بێباوەڕان بیکەنە کارو پیشەی خۆیان و، دڵنیاییش بوو بۆ موسوڵمانان کە بەم پەندانە ئیمان و باوەڕیان بەهێزترو لەبرەودا دەبێت ..

﴿ ان الله لايستحي ان يضرب مثلا ما ، بعوضة فما فوقها ﴾ ..

خوای مەزن پەروەردگاری ورد و درشتەو، بەدیهێنەری مێشوولەو فیلیشە، ئەو موعجیزەیەی لەمێشوولەدا هەیە هەر ئەوە لەفیلیشدا هەیە، کە موعجیزەی ژیانە ، موعجیزەی ئەو نهێنیە شاراوەیەی کە خوای گەورە نەبێت کەس نایزانێ .. بەڵام پەندو ئامۆژگاری لەنمونەکەدایە نەك لەقەوارەو شێوەیدا ، ئەو نمونانە ئامرازێکن بۆ ڕۆشنبیریوچاوکراوەیی .. لەو پەندهێنانەوەیەش هیچ شتێکی وا نەشیاوو لەکەداری تیانیە کەشەرم لەباسکردنیان بکرێت ، خوای گەورە ـ دانایی و زانایی بڵند و شکۆداربێت ـ ئەیەوێت ئەو دڵانەی پێ تاقیبکاتەوە و ئەو دەروونانەی پێ هەڵسەنگێنێت :

﴿ فأما الذين آمنوا فيعلمون انه الحق من ربهم ﴾ ..

چونکە ئەو باوەڕەی هەیانە بەخوای گەورە وایان لێدەکات کە هەرشتێك لەخوای گەورە وەربگرن بەشێوازێك بێت شیاو بەگەورەیی و مەزنی

ئەوبێت و، بەوهەندە بێت کە لەدانایی و زانایی ئەودەیزانن. ئەو باوەڕو ئیمانە ڕۆشناییەکی پڕشنگداری خستۆتە نێو دڵیانەوە و هەستیاریەکی بۆگیان و ڕۆحیان پەیدا کردووەو دیدە ڕۆشنیەکی داوەتە هزروبیریان.. پەیوەندیەکی بەتینیشە لەگەڵ ئەو داناییە بێسنوورو بێکۆتاییەی خوای گەورە کە لەهەرکارو وتەو بڕیارێک کەلەوەوە بۆیان دێتە خوارێ..

﴿ فأما الذين كفروا فيقولون : ماذا أراد الله بهاذا مثلا ؟ ﴾..

ئەمە پرسیارێکە کەسێکی وا ئەیکات کە لە ڕووناکی و دانایی خوا دوورکەوتبێتەوە ، کەسێکە پەیوەندیەکانی پچڕاو و دابڕاوبێت لەگەڵ یاساو فەرمانڕەوایی خوای گەورەدا.. هەروەها ئەمە پرسیاری یەکێکە کە پلەوپایەی شیاو بۆخوا دانانێ و، بەڕەوشتێکی گونجاو بەبەندەیەک لەبەردەم کارە بەجێکانی خواوەندیدا هەڵس و کەوت ناکات و زۆربەنەفامی و گێلی ئەم وتانە ئەڵێتەوە و ناڕەزایی و بەرهەڵستکاری خۆیان بەشێوازێکی ناشرین دەر ئەبڕن، کە لەشێوەی گومان بردنە بەڕاستی دەرچوونی ئەم وتانە کە لەلای خوای گەورە و بالادەستەوە بێت !

ئالەم کاتەدا بەشێوەیەک وەڵام ئەدرێنەوە کە هەڕەشە ئامێزە و ئاگادارکردنەوە پیشان ئەدات، کەبزانن لەپشت ئەم نمونانەوە چ نەخشەو چ ئەندازەیەک هەیە: ﴿ يضل به كثيرا، ويهدي به كثيرا، ومايضل به الاالفاسقين﴾..

خوای گەورە ـ سبحانە ـ وازدێنێت لە تاقیکردنەوەو ئەزموونەکان تا لەڕەوتی خۆیان بەردەوام بن و، بەندەکانیش هەریەک بەپێی سروشت و ئامادەکاری خۆیان وەڵامدانەوەیان ئەبێت بەرامبەر ئەو تاقیکردنەوەو ئەزموونانە ، هەریەک بەگوێرەی ئەو ڕێباز و بەرنامەیەی هەڵیبژاردوە بۆخۆی .. تاقیکردنەوەکەش لەهەموو بارێکدا یەک شتە.. بەڵام شوێنکاریان لەسەر دەروونەکان دەگۆڕێ بەپێی جیاوازیان لەڕێبازو بەرنامەدا.. ناخۆشی و

گرفت دێتەڕێی هەموو خود و دەروونێك.. ئیتر مرۆڤــی موسوڵمانی دڵنیا بەخواو بەبەخشندەیی خوا، ئەم گرفت و ناخۆشیانە پاڵی پێوە ئەنێت بۆ پتر پەنابردن بەخواو زیاتر لێی ئەپاڕێتەوەو لێ ئەترسێت.. بەڵام بۆمرۆڤــی بێباوەڕو دووڕوو ئەم گرفتانە دەیلەرزێنێ و پتر لەخوای دووردەخەنەوەو لەڕێزو لە کاروان دەریدەپەڕێنن.. خۆشی و خۆشگوزەرانیش ڕوودەکاتە هەموو کەسێك ، ئیتر موسوڵمانی لەخواترس ئەو نازو خۆشیانە لەخشتەی نابات و لەخۆبایی نابێت و لەڕێ لاناداو لەو تاقیکردنەوەیەدا تێکناچێت و سەرکەوتوو ئەبێت ، ئەو نمونانەش کە خوا ئەیانهێنێتەوە بۆ خەڵکی هەمووی هەر بەو شێوەیەن﴿ یضل بە کثیرا ﴾ ئەوانەی نازانن چۆن ئاکارە بەجێکانی خوای گەورە لێك بدەنەوە ﴿ ویهدي بە کثیرا ﴾ ئەوکەسانەی لەدانایی خوا باش تێ گەیشتوون ﴿ ومایضل بە الا الفاسقین ﴾ ئەوانەی لەوەوپێش دڵیان ڕەش و پیس بووەو لە ڕاستە ڕێی ئیمان و باوەڕە لایان داوە ، بۆیە پاداشتیان هەر زیاتر بەڕۆخا چوون و قووڵ بوونەوەیە لەو بارودۆخە نەگریسەی تێیدا دەژین !

ڕەوتەکە درێژە بەباسی ئەو بەدڕەفتارانە ئەدات ، هەروەك بەتێرو تەسەلی باسی ڕەوشتی موسوڵمانە لەخواترسەکانی کرد، بوارەکەش تائێستا لەسورەتەکەدا هەر باسی ئەو دەستەو تاقمانەیە ، ئەوانەی نمونەی گرووپی ئادەمیزادن لەهەموو سەردەمەکاندا..

﴿ الذین ینقضون عهد الله من بعد میثاقه ویقطعون ما أمر الله به أن یوصل ، ویفسدون في الأرض ، أولئك هم الخاسرون ﴾..

چ پەیمانێکە لە پەیمانەکانی خوا کە نایبەنەسەر! چ کارێکە لەو کارانەی خوا فەرمانی پێداوە بگەیەنرێ و ئەمان دەیپچڕێنن ؟ چ شێوازێکە لە خراپەکاری لەسەر زەوی وا ئەوانە بەرپای ئەکەن ؟

ڕەوتەکە لێرەدا بەکورتی باسی دەکات ، چونکە بوار بواری دەست نیشان کردنی سروشتێکەو، وێنەکێشانی نمونەکانە، نەك بواری تۆمارکردنی ڕووداوێك ، یا درێژەپێدانی باس و ڕووداوێك بێت ، لێرەدا بەگشتی تەنها نمونەکە مەبەستە، هەر پەیمانێکی نێوان خواو نێوان ئەم تەرزە لەبوونەوەران بێگومان هەڵوەشاوەیە ، وە هەرکارێکیش خوا فەرمانی بەگەیاندنی کردبێت پچڕاو ئەبێ لەنێوانیانداو، هەموو بەدکاریەکیش لەسەر زەویدا هەر لەوانەوە پەیدا ئەبێت .. پەیوەندی ئەم جۆرە خەڵکانە لەگەڵ خوای مەزندا بێگومان پچڕاوەو، سرووشتی پاك و فیترەتیان تێکچوەو هیچ پەیمانێکیان تاسەر نیەو دەست بەهیچ پایەیەکی پتەو و چەسپاوەوە ناگرن و خۆیان لەهیچ خراپەکاریەك ناپارێزن . ئەوانە وەك بەرە دارێکی ڕزیوی لەدارەوە بووی درەختی ژیان بۆگەنن و خراپ بوون و ژیانیش فرێی داونەتە کەنارەوە ، بۆیە لەو پەند و ئامۆژگاریانە ئەوانە زیاتر سەرلێشواو و گومڕا دەبن.. بەپێچەوانەشەوە موسوڵمانان پێی ڕێنماو ڕێ ڕۆشن ئەبن ، تێکچوون و شێوانی ژیانیان هەر بەهەمان هۆکارە کە موسوڵمانە لەخواترسەکانی پێ ڕێنما دەکا و سەریان دەخات. وە ئەو کاریگەریە تێکدەرە دەبینن کە لەلایەن ئەم جۆرە مرۆڤانەوە هەیە .

ئەو کاریگەریە تێکدەرە ئەبینین لەلایەن ئەم جۆرە مرۆڤانەوە کە بانگەشەکە لەشاری مەدینەدا بەرەو ڕوویان ئەبوەوە، لەشێوەی جولەکەو دووڕوان و هاوبەش پەیداکاراندا، هەر ئەوانەشن کە تائێستاش بەرەو ڕوویان دەبنەوە لەسەر ئەم زەویەدا لەگەڵ جیاوازیەکی کەم ، تەنها لەناوو نیشانیاندا!

﴿ الذين ينقضون عهد الله من بعد ميثاقه ﴾ ..

ئەو پەیمانەی خوای گەورە بەستوویەتی لەگەڵ ئادەمیزاد لەگەلێك پەیماندا خۆی دەنوێنێ.. یەکێکیان پەیمانی سرووشتی پاکە (پەیمانی

فیترەت) کە لەناخی هەر زیندوویەك دا ڕەگی داکوتاوە.. تا بەدیهێنەری خۆی بناسێت و بۆ پەرستن ڕووی تێبکات. وە ئێستاش لەسروشتی پاکی هەر مرۆڤێکدا ئەو تینوێتیە هەیە بۆ باوەڕبوون بەخوای تاك و تەنها، بەڵام کە گومڕا ئەبێ لائەداو هاوبەش و هاوتا بۆ خوا پەیدا دەکات.. وە پەیمانێکی تر پەیمانی جێنشینیە لەسەر زەوی کە خوای مەزن لەئادەمی وەرگرت ـ وەك لەمەوپاش باس دەکرێ ـ: ﴿ فاما یأتینکم مني هدی فمن تبع هداي فلاخوف علیهم ولاهم یحزنون.. والذین کفروا بایاتنا اولئك أصحاب النار هم فیها خالدون ﴾.. هەروەها ئەو پەیمانەش کە بۆ هەر نەتەوەیەك هاتبێتە خوارێ کە بەتەنها خوا بپەرستن و، لەژیانیاندا بەرنامەو ڕێبازی ئەو بکەنە فەرمان ڕەوا.. ئەم پەیمانانە هەمووی ئەوانەبوون کە بەدکارەکان ( الفاسقون ) نەیاندەگەیاندەسەرو هەڵیان دەوەشاندەوە، جا گەر پەیمانی خوای گەورە پاش بەستنی هەڵوەشێنرایەوە ئەوە بێ گومان هەموو پەیمانێکی تریش پوچەڵ و هەڵوەشاوە دەبێت.. ئەو کەسەش بتوانێ ڕێز لەپەیمانی خوا نەگرێت ئیتر ڕێز لەهیچ پەیمانێکی تریش ناگرێ .

﴿ ویقطعون ما أمر الله به أن یوصل ﴾..

خوای گەورە فەرمانی داوە بەگەیاندنی چەندین پەیوەندی .. فەرمانی بە گەیاندنی پەیوەندیەکانی خزمایەتی و کەسایەتی داوە ، فەرمانی بەگەیاندنی پەیوەندیە مرۆڤایەتیە بالاکان داوە . پێش ئەوانەش فەرمانی بەگەیاندنی پەیوەندی عەقیدە و برایەتی ئیمانی داوە ، ئەو پەیوەندیەی کە هیچ پەیوەندیەك و نزیك بوونەوەیەکی ڕاستەقینە بەبێ ئەو سەرناگرێ ، جا ئەگەر ئەوکارەی خوای گەورە فەرمانی کردبێ بگەیەنرێ بچڕێنرا ، ئیتر زنجیرەی کارەکان لێك ئەترازێ و پەیوەستەکان شی دەبنەوەو بەدکاری لەسەر زەوی ئەنجامدەدرێ و گێرە شێوێنی هەموو لایەك ئەگرێتەوە .

﴿ ویفسدون في الأرض ﴾ ..

بەدڕەوشتی لەسەر زەوی چەندین جۆرە ، هەر هەمووشیان بە لادان لەوتەکانی خوای گەورەوە سەرهەڵئەدات. لەهەڵوەشاندنەوەی پەیمانی خواوە ڕێچکە دەبەستێ ، لەپچڕانی ئەو پەیوەندیانەی خوای مەزن فەرمانی داوە بەگەیاندنیان دەست پێ دەکات ، سەری گەورەی بەدکاریەکانی سەرزەوی ئەو لادانەیە لەو بەرنامەیەی کە خوای گەورە هەڵی بژاردوە تا ببێتە فەرمانڕەوا لەژیانی مرۆڤایەتیداو بیبات بەڕێوە .. ئەمە دووریانێکە بێگومان کۆتایی هەر بەبەدڕەفتاری و خراپەکاری دێت ، هەرگیز کاری سەرئەم زەویە چاك و ڕەوا نابێت گەر بەرنامەی خوا دوور خرابێتەوە لە بەڕێوەبردنی چالاکیەکانی و شەریعەتی خوا لاوەنرابێت و کاری پێنەکرێت . وە ئەگەر پەیوەندیە پیرۆزەکانی نێوان خەڵکی و پەروەردگاریان بەوشێوەیە پچڕا ئەوە ئیتر خراپەکاری هەموو دەروون و بارودۆخ و، ژیان و گوزەرانەکان دەگرێتەوەو، گشت سەرزەوی و ئەو زیندەوەرو نازیندەوەرانەش کە لەسەرزەوین لەزیانی ئەو خراپەکاریە بەریان دەکەوێ .

ئیتر هەر داڕووخان و شەڕخوازی و بەردکاریەك لە ئاکامی لادان لەڕێبازی خوای مەزنە.. بۆیە ئەو خەڵکەش شیاوی ئەوە دەبن کە خوا سەریان لێ بشێوێنێت، بەهەمان شێواز کە ڕێنمایی بەندە موسوڵمانەکانی خۆی پێ دەکات .

لەم پەردە هەڵماڵینەوە لەسەر کاریگەریەکانی بێباوەڕیی و لادان لەفەرمانی خوا لەم سەرزەویەدا، ڕوودەکاتە هەموو ئادەمیزادو ناڕەزایی دەربڕینی بەرامبەر ئەو بێباوەڕیەی دەینوێنن بەرامبەر ئەو خوایەی زیندووبوونەوەو مردنی بەدەستە، ئەو خوایەی ڕۆزیدەرو بالادەست و فرە زانایە:



﴿ كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَاتًا فَأَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٨﴾ هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ اسْتَوَىٰ إِلَى السَّمَاءِ فَسَوَّاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٩﴾ ﴾ البقرة: ٢٨ ـ ٢٩

**باوەڕ نەبوون بەخوای مەزن لە بەرامبەر ئەم هەموو بەڵگەو نیشانەدا بێ باوەڕیەکی ناشرین و ریسوایە ، بێبەریە لەهەر بەڵگەو پاڵپشتێك.. قورئانیش بەشێوەیەك ڕووبەڕووی ئادەمیزاد ئەبێتەوە کە هەر ئەبێ ڕووبەڕووی ببنەوە و، دانی پیابنێن و ملکەچی بەرنامە داڕێژراوەکانی بن و، لەگەڵ کاروانی ژیان و قۆناغەکانی بوونیاندا بەرەو ڕوویان ئەکاتەوە.. ئەمان مردوویەکی بێ گیان بوون ئەو زیندووی کردنەوە. لەباری بێ گیانیدا بوون هەر ئەو بوو گواستنیەوە بۆ باری ژیان و زیندوێتی. جا ئیتر هیچ چارێك نیەو ئەبێ بەرەو ڕووی ئەم ڕاستیە ببنەوە کە هیچ تەفسیرێکی نیە تەنها لەهێزو توانایەکی بەدهێنەرەوە نەبێت..**

**ئەوان زیندوون، ژیانیان لەبەردایە. جا کێ ئەو زیندوێتیەی بۆ داهێنان ؟ کێ ئەو دیاردە نوێیەی سەر زەوی پڕ لە بێ گیان و مردووەی دروست کرد؟ چۆنیەتی ژیانی شتێکی جیاوازە لە چۆنیەتی ئەو مردن و بێ گیانیەی لە دەورو پشتیدا هەیە. جا ئیتر ئەبێ ئەو لە کوێوە هاتبێ؟ خۆ هیچ چارەیەك نیە لە هەڵاتن لە دەست ئەم پرسیارەی کە جەخت دەخاتە سەر بیرو دەروون. هیچ ڕێیەکیش نیە بۆ زانینی چۆنیەتی دروست بوونی بەبێ هێزێکی بەتوانای بەدیهێنەر، کە سرووشتی زۆر جیاواز بێت لە سرووشتی بوونەوەرەکانی تر.**

ئەم ژیانە لە کوێوە هات کە ڕەفتارێکی تایبەتی هەیەو جیاوازە لە هەموو شتە بێ گیانەکانی دی؟ ... بێ گومان لە لای خوای گەورەوە هاتووە... ئەمە نزیکترین وەڵامە، ئەگەر نا، دەبا ئەو کەسەی ڕازی نیە ملەکەچی ئەم ڕاستیانە بێت ، دەبا بڵێت! وەڵام کوانێ و چۆنە!

هەر ئەم ڕاستیەشە کە ڕەوتی باسەکە خەڵکیی بەرەو ڕوو دەکاتەوە لەم جێیەدا: (( كيف تكفرون بالله وكنتم أمواتا فأحياكم ؟ ))...

وەك ئەم مردووانەی دەورو پشتتان ئێوەش مردوو بوون، کەچی ژیانی کردن بە بەردا (( فأحياكم ))... ئیتر کەسێك ئەبێ چۆن باوەڕ نەهێنێ بەو خوایەی کە زیندوێتی خۆی لەو وەرگرتبێ؟ (( ثم يميتكم ))...

ئەمەیان لەوانەیە هیچ گومان و ڕا گۆڕینەوەیەکی لەسەر نەکرێ چونکە ڕاستیەکە هەموو زیندەوەرانێ بەرەو ڕووی ئەبنەوەو خۆی بە سەرەیان دا ئەسەپێنێ، بۆیە هیچ گومان و گفتوگۆیەکی لەسەر ناکرێ...

(( ثم يحيكم ))...

بەڵام ئەمەیان هەر ئەوەبوو کە گومانیان لێدەکردوو بە کەللە ڕەقیەوە گفتووگۆیان لەسەر دەکرد، هەروەك چۆن هەندێ لە نەفام و ساویلکەکانی ئەمڕۆش گومانی پێ دەبەن، ئەو نەزانانەی کە بەرەو هەڵدێری نەفامی و جەهالەتی سەرەتاکانی پێش چەندەها سەدە شۆڕ بوونەتەوە. خۆ ئەگەر بیر لە دروست بوونی یەکەمین جاریان بکەنەوە ئەوە ئیتر هیچ سەر سوڕمانێکی پێ ناوێت و پێویست بە درۆ خستنەوەشی ناکات.

(( ثم اليه ترجعون ))... هەروەك لە سەرەتادا دروستی کردن هەر ئاواش ئەتان گەڕێنێتەوە ، هەروەك چۆن لەسەر زەوی بڵاوبوونەوە ئاواش کۆتان دەکاتەوە ، هەروەك بە ویستی ئەو لە جیهانی مردووانەوە ڕاپەڕاندنە

جیهانی زیندەوەران ، ئەگەڕێنەوە بۆ لای خۆی تا فەرمانی خۆیتان بەسەردا پیادە بکات و، بە یاسای دروستی خۆی لێتان بپرسێتەوەو دادگایتان بکات.

ئیتر بەو شێوەیە لە تەنها ئایەتێکی کورتدا ژیان تۆماردەکرێت و شیدەکرێتەوە، لە یەك چاو تروکاندا دیمەنی مرۆڤایەتی پیشان دەدرێ کە لە نێو مشتی بەدیهێنەری دایە: بۆ یەکەمین جار لە خامۆشیی مردن دەریدێنێ و بۆ یەکەمین جار گیانی ئەکات بە بەردا دواتریش دەستی مردنیان لێ لێك دەنێ و بۆ یەکەم جار دەیان مرێنێت، پاشان بۆ جارێکی تر زیندوویان دەکاتەوەو لە کۆتایشداو لە ڕۆژی دواییدا ئەیانباتەوە بۆ لای خۆی ، هەروەك یەکەمین جاریش لە لای ئەوەوە دروست کران ... لەم دیمەنە خێرایەدا سێبەری توانایەکی لە بن نەهاتوو وێنە دەکێشرێ و سرووشە کاریگەرە قووڵەکانی ئەڕژێنێتە ناو هەست و دەروونەوە.

پاشان ڕەوتی باسەکە تیشکێکی تری تەواوکەری تیشکی یەکەمین پەخش دەکات:

﴿ هو الذي خلق لكم ما في الارض جميعا، ثم استوى إلى السماء فسواهن سبع سموات ، وهو بكل شئ عليم ﴾...

زانایانی لۆژیك و ڕەوانبێژی زۆریان وتووە دەربارەی دروست کردنی زەوی و ئاسمانەکان، باس لە دیاردەکانی پێشین و دوایینی دەکەن ، باسی سەقامگیری و ڕاوەستان دەکەن... لە بیریان ئەچێ کە ((قبل وبعد)) ((پێشترو پاشتر)) دوو دەستەواژەی مرۆیین و هیچ مانەیەکی بەرامبەرییان نیە گەر لەگەڵ خوای گەورەدا بەراورد بکرێن .. لە بیریان دەچێ کە سەقامگیری و ڕاوەستان دوو دەستەواژەی زمانەوانین کە وێنە بێ سنوورەکان لە بۆچوونە مرۆییە سنووردارەکان نزیك دەخەنەوە... هەر ئەوەندەو بەس ... خۆ ئەو وتووێژە بێ ئەنجامەی کە لە نێو زانا موسوڵمانەکاندا دەوروژێنرا دەربارەی ئەو دەستەواژە قورئانیانە تەنها بریتی بوون لە یەکێك لەو نەخۆشیانەی کە

فەلسەفەی گریکی و باس و توێژینەوە لاهوتیەکانی جولەکەو گاورەکان تێی کەوتبوون ، کاتێ کە تێکەڵاوی بیری عەرەبی خاوێن و بیری ئیسلامی بێگەردیش بوو بوون... جا ئیتر ناشێ ئێمەش تووشی هەمان نەخۆشی ببین و جوانی عەقیدەو بیرو باوەڕو، قەشەنگی قورئانی پیرۆز ناشرین بکەین و بکەوینە کێشەکانی وتەبێژیی بێ ئەنجام !!

ئێستا با بچینە ئەودیوی ئەم دەستەواژانەو بڕوانینە ئەو ڕاستیانەی لەدووتوێیاندا دەرئەکەون و دەربارەی دروست بوونی کەرەستەکانی سەر زەوی کە لە خزمەتی مرۆڤدان و ئەو بەڵگانەی مەبەستی ڕاستەقینەی بوونی مرۆڤ ڕادەگەیەنن و، باس لە ڕۆڵی گەورەی مرۆڤ دەکەن لەسەر ئەم زەوییەو، ئەو نرخ و بەهایەی هەیانە لە تەرازووی دروستی خوای مەزنداو، وە لە سەروو ئەمانەشەوە ئەو ئاکامانەی هەیەتی لە دیاری کردنی بەهای مرۆڤ لە بۆچوونی ئیسلامیداو لە یاسای کۆمەڵگای ئیسلامیشدا...

﴿ هو الذي خلق لكم ما في الارض جميعا ﴾...

وشەی (( لكم )) لێرەدا ماناو مەبەستێکی قووڵی هەیە، بەڵگەیەکی تەواوە لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە مرۆڤی دروست کردوە بۆ مەبەستێکی بالاو گرنگ... دروستی کردوە بۆ جێنشینی لەسەر زەوی، خاوەنی هەموو شتەکانێتی و ئەبێ کارامەو کاریگەر بێت... هەر ئەوە بالاترین بوونەوەر لەم سامان و داراییە بەربلاوەداو سەرداری یەکەمینە لەو بۆماوەو بەخششە فراوانەدا. کەواتە ڕۆڵی لەسەر زەوی و لە ڕووداوو گۆڕانکاریەکانیدا یەکەمین ڕۆڵەو، هەر خۆی سەرداری زەوی و سەرداری ئامرازەکانێتی! ئەو نابێتە بەندەی ئامرازەکان وەك لە جیهانی ماددی ئەمڕۆدا دەیبینین، ئەو نابێتە پاشکۆی ئەو گۆڕانکاریانەی کە ئامێرەکان بەرپای ئەکەن لە مەڕ پەیوەندیەکانی ئادەمیزادو بارودۆخەکانیدا، وەك لایەنگرە داماوەکانی ماددیەت ئەیڵێن... ئەوانەی کە ڕۆڵ و باری مرۆڤ بە سووکی سەیر دەکەن.

ئەو سەرداره ڕێزداره دەکەنه کلك و پاشکۆی ئامێره بێ گیانەکان! هیچ کام له بەها مادديەکان ناشێ زاڵبکرێ بەسەر بەها مرۆییەکانداو، ناشێ مرۆڤـ سەرشۆڕ و مل کەچ بکات یا بە سەریدا باڵا دەست بێت ، هەر ئامانجێکیش ببێته مایەی سووك کردنی بەهای مرۆڤـ، با سوودو قازانجی مادیشی هەبێت ، ئەوه ئامانجێکه لەگەڵ مەبەستی بوونی مرۆڤایەتیدا دژو نەگونجاو ئەبێت. چونکه ڕێزی مرۆڤـ و سەربڵندی مرۆڤـ لە پێشەو هەر ئەوه سەردارو سەروەر پاشان بەها مادیەکان بە دوایدا دێن و دەبنە مل کەچ و خزمەتکاری .

ئەو بەهرەیەی کە خوای باڵادەست لێرەدا دەیکاتە منەت بەسەر خەڵکیەوه ـ لەگەڵ ئەوەی نارازیشه له بێ باوەڕیان ـ تەنها ئەو بەخششه فراوانه نیه کە پێی داون لە هەندێ لە پێداویستیەکانی سەر زەوی. نەخێر بەڵکوـ لەگەڵ ئەوەشدا ـ سەرداریی و دەسەلاتداریانه بەسەر سەرجەم بوونەوەرەکانی سەر زەویداو بەهاو نرخێکی زیاتری پێبەخشیون و له هەموو بەها مادیەکانی تری سەر زەوی جیای کردوونەتەوەو بڵندتری کردوون. کە گەورەترین بەهرەی بێ گومان بریتیە لە نازو بەهرەی جێنشینی و ڕێز لێنانی ، هاوکات لەگەڵ بەهرەی خاوەندێتی و سامانداری بەها مادیەکان و سوود وەرگرتنیشە لێیان .

﴿ ثم إستوى إلى السماء فسواهن سبع سماوات ﴾...

هیچ بوارێك نیە بۆ گەڕان بەدوای مانای ڕێك ڕاوەستان ((الإستواء)) تەنها ئەوه نەبێت هێمایەکە بۆ دەسەلات ، کە مەبەست لە تواناو ویستی بەدیهێنان و دروست کردنە. هەروەها هیچ بواری ئەوه نیە بە دووی مانای حەوت ئاسمانەکان بکەوین و سنوور بۆ شێوه و دووریەکانی دابنرێت. بەڵکو واباشترە تەنها لە سنووری مەبەستە گشتیەکەی ئەم دەقەدا بوەستین ، کە ئەویش دروست کردن و ڕێکخستنی زەوی و ئاسمانە هاوکات لەگەڵ نارەزایی دەربڕین سەبارەت بێ باوەڕی مرۆڤـ بەرامبەر خوای بەدیهێنەری

باڵادەست بەسەر هەمووگەردووندا، ئەو خوایەی سەرجەم کەرەسەکانی سەر زەوی بۆ ژێردەستەکردوون و، ئاسمانەکانی وا جوان ڕێك خستووە کە ژیانی سەر زەوی ئاسانترو لەبارترو خۆشتر بکات.

﴿ وهو بكل شئ عليم ﴾:

لەبەر ئەوەی بەدیهێنەری هەموو شتێکە، هەڵسوڕێنەری هەموو کارێکیشە، وە مانای فراوان و سەرتاسەری زانست هەروەك مانای بەربڵاوو بێ سنووری هەڵسوڕان و بەڕێوەبردنە کە یەکێکە لە خاڵەکانی هاندەر بۆ باوەڕهێنان بەخوای تاك و تەنهاو، ڕووکردنە ئەو تاکە هەڵسوڕێنەرە بە پەرستن و، تەنها ئەو ڕۆزی دەرو بەخشندەیە بپەرسترێت وەك پێزانین و ستایشێك بۆ بەخشندەیی و دەست بڵاویە پیرۆزەکەی...

بەم شێوەیە قۆناغی یەکەم لەم سورەتەدا تەواو دەبێت... هەر هەمووشی بە تێرو تەسەلی جەخت لەسەر بابەتی ئیمان دەکاو. بانگەشە بوو بۆ هەڵبژاردنی کاروانی باوەڕدارە لە خواترسەکان...

﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ ....أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ البقرة: ٣٠ - ٣٩.

چیرۆك لە قورئاندا لە زۆر جێگاو بۆنەدا باس دەکرێت . جا ئەو بۆنانەی چیرۆکەکەی دەربارە ئەگوترێت دەست نیشانی ڕەوتی چیرۆکەکە دەکات و، ئەو بەشەش دیاری دەکات کە پیشان ئەدرێت، یا ئەو وێنەیە دەنەخشێنێ کە نمایشی دەکات و شێوازی دەربڕینەکەشی پەخش ئەکات. ئەمانەش هەموو لە پێناو ڕێکخستنی ئەو بارودۆخە ڕۆحی و هزری و هونەریەیە کە تیایدا پیشان ئەدرێ ئیتر بەو شێوەیە ڕۆڵە دیاری کراوەکەی خۆی ئەبینێ و

مەبەستە بە نرخەكەی جێبەجێ دەكات و ئەو ئیقاعەشی كە پێویست بێ پەخشی ئەكات.

زۆر كەس وا ئەزانێ كە جۆرە دووبارە بوونەوەیەك هەیە لە چیرۆكەكانی قورئاندا، چونكە لەوانەیە تەنها چیرۆكێك چەند جارێك و بە چەند شێوەیەك باس بكرێت. بەڵام گەر بە چاوێكی وردبینەوە تەماشا بكرێت دەزانرێت كە هیچ بەسەرهاتێك یا هیچ بەشێك لە چیرۆكێك لە یەك شێوەدا دووبارە نەبۆتەوە ، چ لە لایەنی ئەو هەندەی كە باس دەكرێت، یاخود لە شێوەی نمایش كردنی لە باسەكەیدا. هەر كاتێكیش بەشێك دووپات كرابێتەوە ئەوا مەبەستێكی نوێی لە خۆگرتوە ئەوە دەسەلمێنێ كە ئەو بەشە بە هەمان شێوە دووبارە نەبۆتەوە.

هەندێ كەسیش لادەدەن و ئەڵێن گوایە هەندێك لەو بەسەرهاتانە ڕاست نین ودروستكراون یاخود دەستكاریان كراوە ، كە تەنها مەبەستی دەرخستنی لایەنە هونەریەكەیە بە مانای نەخشاندنێك كە پابەندی واقیع و ڕاستییەكان ئەبێت ، بەڵام ئەو ڕاستیەی كە هەموو یەكێك هەستی پێ دەكات كاتێ كە ئەم قورئانە ئەبینێ ــ گەر ئەو كەسە كرۆك و فیترەتی ڕاست و خاوێن بێ و دیدی كراوەبێت ــ ئەبینێ كە بۆنەی بابەتەكان ئەو بەشە لە چیرۆكەكە دیاری دەكات كە باس ئەكرێت لە هەر جێیەكدا، وە لە هەمان كاتیشدا شێوەی باسكردنەكەو تایبەتمەندیەكانی و نمایشكردنەكەشی دیاری ئەكات. قورئان پەرتووكی بانگەوازكردنەو دەستووری یاسایەكەو، ڕێبازی ژیانیشە، نەك پەرتووكێك بۆ گێڕانەوە یا كات بەسەبردن وە یاخود مێژوویی بێت. وە لە ڕەوتی بانگەوازەكەشەوە چیرۆكەكان هەڵدەبژێردرێن، كە بە ئەندازەو شێوازی گونجاو لەگەڵ بارودۆخی باسەكەداو جوانیەكی هونەریی ڕاستگۆ ئەنجامدەدات، بەبێ پشت بەستن بە بابەت دروستكردنی ناقۆڵاو ڕازاندنەوەی دوور لە ڕاستی، بەڵكو پشت ئەبەستێت بە جوانی و

داهێنـــان لـــە نمایـــشکردنیداو لەســـەر هێـــزی هـــەق و راســـتی و بـــە رێکـــی و قەشەنگیش لە ئەنجامدانیدا[1]..

بەسەرهاتی پێغەمبەران لە قورئاندا نموونەی کاروانی ئیمان و باوەڕە لە ڕێگا دوورو درێژە بەردەوامەکەی دا ، چیرۆکی بانگەشەی بەرەو لای خواو بەدەنگـەوە هـاتنی نـەوەکانی مرۆڤـایەتی بـۆ ئـەو بانگـەوازە بـاس دەکـات. هـەروەها سروشـتی ئیمـان و بـاوەڕ دەرئـەخات لـە دەروونـی ئـەو دەسـتە هەڵبژاردەیەی نێو ئادەمیزاددا، وە چۆنیەتی تێڕوانینیان بۆ ئەو پەیوەندیـەی لە نێوان خۆیان و پەروەردگاریانداهەیە ، ئەو پەروەردگارەی کە بەو بەخشش و بـەهرە مەزنـە نـاودارو پایـەداری کـردن... وە بەدواداچـوونی ئـەو کاروانـە مەزنـە لـە ڕەوتـە فراوانەکەیـدا خۆشـی و ڕەزامەنـدی و ڕوونـاکی وبینـایی دەڕژێنێتـە نـاو دڵ و دەروونـەوەو وای لێـدەکات کـە هەسـت بـەو توخمـە گرانبەهایە بکـات ـ توخمی ئیمـان و باوەڕ ـ وە هەسـت بـەو ڕەسـەنایەتیەی بکـات کـە هەیـەتی لـە بوونـدا. هـەروەها ڕاسـتیی دیـدو بۆچـوونی بـاوەڕداران ئاشکرا ئەکات و لـەناو هەسـت و نەسـتدا دا جیـای دەکاتـەوە لـە هـەموو دیـدو بۆچوونە دزێوەکانی تر، بۆیە ئالێرەوە ئەو چیرۆکانە بەشێکی ئێجگار گەورەو زۆر بە نرخن لە پەرتووکە بەهرەدارو مەزنەکەی ئەو بانگەوازە پیرۆزە.

ئێستاش با سەیرێکی بەسەرهاتی ئادەم بکەین ـ وەك لێرەدا هاتووە ـ لە ڕۆشنایی ئەم ڕوونکردنەوانەدا...

ڕەوتەکـە لەمـەو بـەر کـاروانی ژیـان پیـشان ئـەدات، نـا بـەڵکو کـاروانی سەرجەم بوونەوەران. پاشان باس لە زەوی دەکات ـ لـە دوو تـوێی باسـکردنی بەهرە باڵاکانی خوای گەورە کە بۆ خەڵکی واڵا کردووە ـ ئەوە بڕیار ئەدات کە

---

[1] بڕوانە بەشی ((القصة في القرآن)) لـە کتێبی ((التصوير الفني في القرآن)) . (دار الشروق).

خوا ئەو هەموو شتانەی سەر زەوی بۆ ئەوان دروستکردووە... ئیتر هەر لێرەو لەم کەشەدا باسی جێنشینی ئادەم لەسەر زەوی دەکرێ و، چۆن کلیلی دەروازەکانی دراوەتێ، بەپێی پەیمان و بەڵێنێك و لەسەر چەند مەرجێك لەگەڵ خوای گەورەدا، وە ئەو زانیاریانەشی پێدراوە تا ئەو جێنشینیەی بە چاکی بگەیێنێتە ئەنجام. هەروەها سەرەتایەکیشە بۆ باسکردنی بەسەرهاتی جێنشینی بەنی ئیسرائیل لەسەر زەوی بەپێی فەرمان و بەڵێنێك لە لایەن خوای مەزنەوە، پاشان چۆن ئەو جێنشینیەیان لێسەندرایەوەو کلیلەکان درانە دەست نەتەوەی موسوڵمانی وەفادار کە پەیمانی خوای بە چاکی گەیاندە سەر (وەك باسی لێدەکرێ لەمەودوا) ئیتر چیرۆکەکە لەگەڵ ئەو کەشەی تیایدا باس کراوە بە جوانترین شێوە دەگونجێت. دەسا با چەند ساتێك لەگەڵ یەکەمین بەسەرهاتی مرۆڤـایەتیدا بژین و بزانین چ سروشێك و کاریگەریەکی ڕەسەنی لەدواوەیە:

وا ئێمە هەموو ـ بە چاوی گەشدیدەوە لە ساتە ڕۆشنە بەربلاوەکاندا ـ لە گۆڕەپانی گیانە پاکە بڵندەکاندا (فریشتەکان) یەکەمین چیرۆکی ئادەمیزاد ئەبیستین و دەبینین :

﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوٓا۟ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ قَالَ إِنِّيٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾﴾ البقرة: ٣٠

﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً ﴾...

کەواتە ئەمە ویستی باڵای خوایە کە دەیەوێ سەروەریی ئەم زەویە بداتە دەست ئەو دروستکراوە نوێیەکەی لەم بوونەوەرەدا، دەست و توانای سەربەست دەکاو ئەوەشی فێردەکات کە ویستی خواوەند لە بەدیهێنان و

دروســــتكردن و شـــيكردنەوەو پێكهێنـــان و، دەســـتكاری كـــردن و گۆڕانكاريەكانيدا ئاشكرا بكات، ئەو هەموو هێزو وزەو كانزاو سامانەی لەم زەويەدا هەيە بياندۆزێتەوەو هەر هەمووی ـ بەفەرمانی خوا ـ بەكاربێنێت بۆ جێبەجێكردنی ئەو ئەركە گەورەيەی كە خوای مەزن پێی سپاردوە .

كەواتە ئەم بوونەوەرە نوێيە ئەوەندە وزەی شاراوەو توانای ناديارى بێ بەخشراوە كە بەرابەربێت لەگەڵ ئەو هێزو وزەو كانزاو سامانەی لەسەر زەويدايەو، ئەوەندەش هێزی نەبينراوی دراوەتێ كە ويستی پيرۆزی خواوەندی پێ جێبەجێ بكات. كەواتە جۆرە يەكێتی و گونجانێك لە نێوان ئەو ياسايانە دا هەيە كە زەوی دەبا بەڕێوە– هەمووگەردوونيش دەبا بەڕێوە ئەو ياسايانەش كە ئەم بوونەوەرەو هێزو وزەكانی ئەبات بەڕێوە، تا هيچ پێك دادان و نەگونجانێك لە نێوان ئەو ياسايانەو ئەم ياسايانەش دا ڕوونەدات و، تا وزەی مرۆڤيش لەسەر تاشەبەردی گەردوون وردو هەراش نەبێت!

كەواتە ئەوە پلەو پايەيەكی ئێجگار بڵندو گەورەيە، پايەی ئەم مرۆڤـەيە، لە ياسای بووندا و لەسەر ئەم زەويە فراوانەدا ئەمەش ئەو ڕێز لێنانەيە كە خوای مەزن و بەديهێنەر ويستی لە مرۆڤی بنێت ...

ئەمانە هەمووی هەندێك لەو سرووشانە بوون كە لەو گوزارشتە بالأيەی خوای گەورەدا دەردەكەوێت: (أني جاعل في الارض خليفة).

ئەمرۆ بەهەستێكی زيندوو وەبەدێكی كراوەوە تێی دەڕوانين لەگەڵ بينينی ئەو كارانەی لەسەر ئەم زەويەدا ئەنجامدراون لەسەر دەستی ئەم بوونەوەرە جێنشينەی سەر ئەم سامان‌و دارايیە بەرفراوانە!

﴿ قَالُواْ... أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاء وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ﴾

... ئـەم قـسانەی فریـشتەکان ئـەوە دەگەیـەنیت کـە بـەهۆی ئـەزموونی پێـشتریان ، یـا بـە بەرچـاوڕوونی خۆیـان ، هەنـدێ شـت لـە سروشـتی ئـەم بوونەوەرەیان بۆ ئاشکرا بووبێت ، یا هەندێ لە ڕەفتارەکانی داهاتووی ژیانی سەر زەوییان بۆ دەربکەوێت کە وایان لیّ بکات پێشبینی ئەوە بکەن کە لە داهـاتوودا ئـەم بوونـەوەرە لەسـەر زەویـدا خراپـەکاری ئەنێتـەوەو، لەوانەیـە خـوێنیش بڕێـژێت... پاشـان ئـەمان ــ بـە سروشـتی پـاك و بـێ گونـاهی فریـشتەیی کـە تـەنها خێـرو چـاکە خـوازی ڕەهـاو ئاشـتیەکی سەرتاسـەری دەزانێت ـ وا ئەبینن کە سوپاس و ستایش کردن و ڕێزلێنـانی خـوای گـەورە تاکە مەبەستی هەمیشەیی ئەم بوونەیەو، بە تـەنها هـەر بۆ ئەو مەبەستەش دروستکراوە... وە هەر بە بوونی ئەوانیشەوە ئەم مەبەستە دەگاتە سـەر، جا هەر ستایشی خواو ڕێزلێنانی خوا پیشەیانەو، بەبێ هـیچ ساردو سڕیەك بـە بەردەوامی لە پەرستنی خوای گەورەدان ...

کەچـی ئـەو ویـستە بالآیـەی خـوای گـەورەیان لـیّ ئاشـکرا نـەبوو لـە دروسـتکردن و ئـاوەدان کردنـەوەی ئـەم زەمینـەو، مەبەسـت لـە بوژاندنـەوەو ڕازاندنـەوەی ژیانیـان نـەدەزانی، ویـستی بەدیهێنـەر لـە یاسـای بوونـەوەرانیان نەدەزانی لە گەشـەپێدان و بایـەخ دان و ڕاسـتکردنەوەی ژیـان لەسـەر دەسـتی جێنـشینی خـوا لەسـەر زەویـدا. ئـەو بوونـەوەرەی کـە لەوانەیـە جـار جـارە خراپەکاریش بکات ، یا خوێن ڕشتن یەکێك بێت لە چالاکیەکانی، تا لـە دوای ئـەو هەنـدە لـە خراپـەکاری، چـاکەو چاکەخوازیەکی گـەورەترو سەرانـسەری ئەنجام بـدات، چاکەی گەشـەیەکی بـەردەوام و، بڵندیـەکی بێ پایـان، چاکەی جوڵـەی ڕوخێنـەر و بنیاتنـەریش . چـاکەی هـەوڵێکی نـەبڕاوەو نەوەسـتاو و گۆڕانکاری و پەرەپێدان لە نێو ئەم سامانە گەورەو فراوانـەدا، ئا لـەو کاتـەدا بڕیاری خوای زانا بە هەموو شتێك، خـوای شـارەزا لـە داهـاتووی هـەموو کـارو کردەوەیەکیان بۆ هات:

﴿ قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴾...

﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِى بِأَسْمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَكَ لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣٢﴾ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ ۖ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسْمَآئِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّىٓ أَعْلَمُ غَيْبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾ البقرة: ٣١ - ٣٣

وا ئێمەش هەموو بەدیدی ڕۆشن و لە ساتە ناسکە بێ داریەکاندا ئەوە ئەبینین کە فریشتەکان لە کۆمەڵی پایە داری خۆیاندا بینیان ... وا ئێمە چمکێك لەو نهێنیە خواییە ئەبینین کە خوا کردی بە بەرگی ئەم بوونەوەرە ئادەمیەدا، کاتێ کە کلیلی دەروازەکانی جێنشینی ئەداتە دەست، نهێنی توانای ناولێنان و ناسینەوەی شتە ناو لێنراوەکان. نهێنی توانای ناولێنانی کەسان و شتەکان ـ بە ناوێك کە زاراوەیەکی گوتراون ـ تا بکرێتە هێما بۆ ئەو کەسانەو بۆ شتە هەست پێ کراوەکانیش. ئەمەش توانایەکە کە بەهایەکی گەورەی هەیە لە ژیانی مرۆڤ لەسەر ئەم زەویە دا. بەهاکەی کاتێك ئەزانین کە ئەو گیروگرفتەمان بۆ دەرئەکەوێ گەر مرۆڤ ئەو توانایەی نەدرابایە بۆ ناونانی شمەکەکان و ئاڵۆزی تووش بهاتایە لە کاتی مامەڵەو گفتوگۆ کردندا، کاتێ کە هەریەکێك پێویستی بە ئامادەکردن و هێنانی ئەو شتانە ئەبوو کە بیویستایە لەسەری پێك بێت لەگەڵ بەرامبەرەکەیدا، کێشەکە کێشەی دارخورمایەك بوو کە نەدەگونجا خودی دارخورماکە دەربهێنرایەو بخرایەتە بەردەست کاتێ کە باسی لێبکرایە! کێشەکە کێشەی چیایەك بوو، جا چۆن دەگونجا لە کاتی باسکردنی دا هەموو بەرەو ئەو چیایە بچوونایە تا بیانزانیایە کە باسەکە باسی چیایە! کێشەکە کێشەی کەسێکی نەناسراوە!

جا چۆن دەبوو بۆ تێگەیشتن لە بابەتەکە ئەو کەسە بهێنرایەتە گۆڕێ و پاشتر باسی لێ بکرایە... ئەم کارە گیروگرفتێکی ئێجگار گەورەیە، چۆن بەو شێوەیە ژیان دەچووە سەر ، نەخێر... بە هیچ جۆرێك ژیان نەدەچووە سەرو بەردەوام نەدەبوو گەر خوای گەورە توانای ناولێنانی شتەکانی نەبەخشیایە بەو بوونەوەرە نوێیەو فێری نەکردایە.

بەڵام فریشتەکان پێویستیان بەم کارە تایبەتیە نیە، چونکە هیچ پێویستیەکیان پێی نابێ بۆ ئەنجام دانی کارەکانیان ، بۆیە ئەم توانایەیان نەدراوەتێ، وە ئەو کاتەی خوا ئەم نهێنیەی فێری ئادەم کردو لەو کاتەی کە ئەو شتانەی داینابوو پیشانی دان، فریشتەکان ناوەکانیان نەزانی، نەیانزانی چۆن هێمای گۆتراو دابنێن بۆ شتەکان و کەسەکان... بەرامبەر ئەم نەتوانینە سەرجەم بە دەنگی بەرز پاکێ و پایە بڵندیو باڵادەستی خوای گەورەیان بڕیارداو دانیان بە کەم دەسەڵاتی خۆیانداناو، زانیان کە سنووری زانینیان فراوان نیەو هەر ئەوەندەیە کە خوای گەورە فێری کردوون... بەڵام ئادەم ئەو ناوانەی زانی، هەر بۆیە ئەم باسەی خوارەوە بەدوای بابەتەکەدا دێت تا بیانگێڕێتەوە سەر تێگەیشتنی بڕیارەکانی خوای فرە داناو فرە زانا:

﴿ قال: الم اقل لكم إني اعلم غيب السموات والارض واعلم ماتبدون وماكنتم تكتمون ؟ ﴾

﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ (٣٤) ﴾ البقرة: ٣٤

ئەمە رێز لێنانێك بوو لە بەرزترین شێوەیدا، بۆ ئەو بوونەوەرە بەد رەفتارو خوێن رێژەی سەر زەویا بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەندە نهێنی دراوەتێ گەر بیەوێ دەیگەیەنێتە پلەیەك بەرزتر بێ لە پلەی فریشتەکانیش. نهێنی زانیاریەکانی دراوەتێ، هەروەها نهێنی ویستی سەربەخۆی دراوەتێ تا سەرپشك بێت لە هەڵبژاردنی رێگای ژیانی خۆی... دوو لایەنیی لە سروشت

و ، توانـای هەڵبـژاردن و ڕێگـە گرتنەبـەری ئـەو ڕێبـازەی مەبەسـتی بـێ، هـەروەها گرتنـە ئەسـتۆی ئـەرکی ڕێنمـایی کردنـی خەڵکی بـەرەو لای خـوا بـە تواناو هەوڵدانی تایبەتیی خۆی. ئەمانە هەمووی هەندێکن لە نهێنی ڕێزلێنان لەو بوونەوەرە.

ئیتر فریشتەکان هەموو ملکەچی فەرمانی باڵاو پیرۆزی خوای گەورە بوون و کڕنووشی ڕێزلێنانیان بۆ برد...


﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا لِـَٔادَمَ فَسَجَدُوٓا إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٣٤﴾ ﴾ البقرة: ٣٤

لێـرەدا ڕەفتـاری بەرجەسـتەکراوی خراپـەکاریی دەرئەکـەوێت : سەرپێچی کردنـی فـەرمانی خـوای پایـە بەرزا لووت بەرزی و بـە کـەم زانینی چاکەو بەخششی کەسانی تر. شانازی کردن بە گوناه و خراپـە کردن. مێشك داخستن لە تێگەیشتنی ڕاستیەکان .

لە ڕەوتی باسەکەوە دەرئەکەوێ کە (ئیبلیس) لـە تـوخمی فریشتەکان نـەبوو بـەڵام تێکـەڵاویان بـوو، چونکە گـەر لـەوان بوایـە سەرپێچی نـەدەکرد، چونکە یەکـەمین ڕەوشـتی فریشتەکان ئەوەیـە کـە ﴿ لايعـصون الله مـا أمـرهم ويفعلون مايؤمرون ﴾... جیاکردنەوەی (ئیبلیس) لێرەدا مانـای ئـەوە نیـە کـە لـە هـەمان تـوخمی فریشتەکانە چـونکە کـە لەگـەڵیان بـوو دەشـێ جیـاش بکرێتەوە ، هەروەك کە بڵێن : فلانە خێڵ هاتن ئەحمەد نەبێت. ئـەو لـەو خێڵـە نیـە بـەڵام تێکـەڵاوە لەگـەڵیان ، وە بـە پێـی دەقـەکانی قورئـان ئیبلـیس لـە جنۆکەکان بووە ، خوای گەورە خۆی جنۆکەی لە کڵپە ئاگرێك دروستکردوە ، ئەمەش بێ گومان ئەوە دەسەلمێنێ کە لە توخمی فریشتەکان نیە.

وا ئێستا گۆڕەپانی شەڕە فراوانەکە ئاشکرا بوو، شەڕی نێوان سروشتی شەڕەنگێزی لە ئیبلیس داو، نێوان جێنشینی خوا لەسەر زەوی . ئەو شەڕە لە بن نەهاتوەی ناو ویژدانی مرۆڤــ ، ئەو شەڕەی کە خێرو چاکەخوازی تیایدا سەردەکەوێ بە ئەندازەی پابەندبوونی مرۆڤ بەویستو توانای خۆیو بەو پەیمانەی بەستوێتی لەگەڵ پەروەردگاریدا ، شەڕو شەڕەنگێزیش تیایدا سەردەکەوێ بە ئەندازەی خۆبەدەستەوەدانی مرۆڤــ بۆ ئارەزووەکانی و بە ئەندازەی دوورکەوتنەوەی لە پەروەردگاری :

﴿ وَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ (٣٥) ﴾ البقرة: ٣٥

هەموو بەروبوومەکانی بەهەشتیان خرابوە بەردەست و ئازادبوون لە سوود لێوەرگرتنیان یەك درەخت نەبێ... بە تەنها یەك درەخت ، کە لەوانەیە هێمایەك بێت بۆ قەدەغەکردن ، کە هەر دەبێ لە ژیانی سەرزەوی دا نموونەی هەبێت. چونکە بەبێ شتی قەدەغە کراو ویستی مرۆڤــ گەشە ناکات و مرۆڤــی خاوەن ویست لە ئاژەڵی ملکەچ جیا نابێتەوەو، ئارام گرتنی ئادەمیزاد لەسەر گەیاندنی پەیام و پابەندبوونی بە مەرجەکانیەوە تاقی نابێتەوە. چونکە ( ویست ) دووڕیانێکی جیاکەرەوەیە ، ئەو کەسانەش کە بەبێ ویست ڕادەبوێرن بێ گومان لە جیهانی ئاژەڵیدان ، با لە شێوەی ئادەمیزادیش دا دەربکەون :

﴿ فَأَزَلَّهُمَا الشَّيْطَانُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ ﴾...

ببینە ، ئەم دەستەواژە وێنە ئامێزە : (( أزلهما ))... گۆتەیەك وێنەی ئەو بزاڤە دەکێشێ کە نمایشی دەکات ، ئیتر وا هەست ئەکەیت کە چاوت لە شەیتانە چۆن دەیەوێت لە بەهەشت دەریانپەڕێنێ و، پاڵیان پێوەبنێ ، تا هەڵخلیسکێن و بەرەو هەڵدێر شۆڕببنەوە !

هەر لەو کاتەدا ئەزموونەکە ئەنجامدرا ، ئادەم پەیمانەکەی خوای لە بیرکردو، لە بەردەم هەڵفریواندا لاواز بوو، هەر لەبەر ئەوەش بوو کە بەڵێنی خوا ئەنجامدراو جێبەجێکردنی ئاشکرا کرا:

﴿ فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ ۖ وَقُلْنَا ٱهْبِطُوا۟ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٣٦﴾ ﴾ البقرة: ٣٦

ئەمەش جاڕدانێك بوو بۆ بەرپاکردنی جەنگەکە لەو بوارەی کە بۆی تەرخان کرابوو. لە نێوان شەیتان و ئادەمیزاددا و تا ژیانیش کۆتایی پێ دێت هەر بەردەوامە.

ئادەم لەو هەڵەتەی دابووی هەستایەوە ، چونکە لە سروشتی پاکیدا هەستانەوە چێنرابوو، بەزەیی خواش فریای کەوت ، ئەو بەزەییەی هەر کاتێ داوای بکات فریای دەکەوێت و پەنای ئەدات.

﴿ فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٣٧﴾ ﴾ البقرة: ٣٧

وتەی کۆتایی خوای گەورە ئەنجام دراو، پەیمانە بەردەوامەکەی لەگەڵ ئادەم و نەوەکانیدا تۆمارکراو، پەیمانی جێنشینی لەسەر ئەم زەویەو، مەرجی سەرکەوتن و سەرفرازی یاخود سەرنەکەوتن و دۆڕان.

﴿قُلْنَا اهْبِطُوا مِنْهَا جَمِيعًا فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَن تَبِعَ هُدَايَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ (٣٨) وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ (٣٩)﴾ البقرة: ٣٨ - ٣٩

جەنگ و ڕووبەڕووبونەوەی بەردەوام گوێزرایەوە بۆ گۆڕەپانی ڕەسەنی خۆی ، پەتی خۆی پچڕیوەو ئیتر بۆ تاکە ساتێکیش ڕاناوەستێ و سارد نابێتەوەو، هەر لە بەرەبەیانی مرۆڤایەتیەوە ئادەمیزاد زانیویێتی ، گەر بیەوێ ، چۆن سەر ئەکەوێ ـ گەر ئارەزووی سەرکەوتنی هەبوو ـ چۆنیش دەڕوخێ و دەبەزێ گەر بەزین و دۆڕان بۆ خۆی هەڵبژێرێ .

جا ئیتر پێویستە بگەڕێینەوە سەرەتای چیرۆکەکە ، یەکەمین چیرۆکی مرۆڤایەتی.

خوای باڵا دەست بە فریشتەکانی فەرموو: ﴿ إني جاعل في الارض خليفة﴾... کەواتە ئادەم هەر لە یەکەم ساتەوە دروست کراوە بۆ ژیان لەسەر ئەم زەویە. ئیتر بۆچی ئەو درەختەی لێ قەدەغە کرا ؟ بۆ ئادەم بەو شێوەیە تاقیکرایەوە ؟ بۆ لە جێیەکی ترەوە هێنرانە خوارەوە بۆ سەر زەوی ، گەر هەر لە یەکەم ساتیەوە بۆ ژیان لەسەر ئەم زەویە دروست کرابێ؟

من وا ئەبینم مەبەست لەم ئەزموون وتاقیکردنەوەیە پەروەردەکردن و ئامادەکردنی ئەم جێنشینە بووبێت. بێداربوونەوەی هێزە شاراوەکانی ناو ناخی بوو. ڕاهێنانێك بوو بۆ بەرەو ڕووبونەوەی هەڵفریوان و لە خشتەبردن و، چێشتنی ئاکامەکانی و نۆشینی جامی پەشیمان بوونەوەو، ناسینی دوژمنان و، پەنا بردنە بەر تاکە پەنای هێمن و ئارام بەخش. ئیتر بووبێتە بەسەرهاتی ئەو درەختە قەدەغەکراوەو ئەو هاندانە شەیتانیە بۆ خۆشیەکان و، لەبیرچوونەوەی پەیمان و سەرپێچی کردن و، بێداربوون وهۆشیاری پاش

سەرخۆشی و بێ ئاگایی و، پەشیمان بوونەوەو داوای لێخۆشبوون... ئا ئەمانەن ئەزموونی دووبارە وە بووی هەمیشە نوێی مرۆڤایەتیە!

بەزەیی خوای گەورە بۆ ئەم بوونەوەرە وابوو کە ئەم بەدیهێنراوە بەرەو بارەگای خۆی بێتەخوارەوە ـ پاش ئەوەی بەم ئەزموونە دەوڵەمەنکراو وەك توێشوویەك بوو بۆی ، کە زۆرجاری تریش نموونەی وای دێتە ڕێی و بەرەو ڕووی دەبێتەوە، تا ئامادەبێت بۆ ئەو جەنگە بەردەوامەو، ئامۆژگاری و ئاگاداریەکیش بێت بۆی .

پاشان و، وە جارێکی تریش ئا ئەمەی کە ڕوویدا لە چ جێیەك بوو؟ ئەو بەهەشتەی ئادەم و هاوسەرەکەی بۆ ماوەیەك تیا ژیان چی و چۆن بوو؟ فریشتەکان کێن ؟ ئیبلیس کێیە ؟... خوای گەورە چۆن ئاخاوتنی لەگەڵ کردن و ؟ چۆن وەڵامیان دایەوە ؟...

ئەمانە و نموونەی ئەمانەش لە قورئانی پیرۆز دا نادیارو غەیبن ، لەو شتە نادیارانەی کە خوای باڵادەسەت هەر خۆی دەیزانێ و، بە زانایی بەرزی خۆی ئەزانێ کە هیچ سوودێکی نییە گە ر ئادەمیزاد چۆنیەتی و نهێنیەکانی بزانێت یاخود نەزانێت ، هەر بۆیە توانای زانین و تیگەیشتنی ئەو بابەتانەی نەداونەتێ بە بەکارهێنانی ئەو ئامرازانەی پێی بەخشیون بۆ جێنشینیان لەسەر زەوی و، لە پێویستیەکانی جێنشینی نیە کە مرۆڤ ئەو غەیب و نادیارانە بزانێت. وە بەو هەندەی کە خوای مەزن یاساکانی گەردوونی بۆ مرۆڤ ئاسان کردووە و نهێنیەکانی بۆ ئاشکرا دەکات ، بەو هەندەش نهێنیەکانی غەیبی لێ شاردۆتەوە لەو بوارانەی کە زۆر پێویست نییە بیانزانێ، هەر بۆ نموونە تا ئێستا مرۆڤ لەگەڵ ئەو هەموو زانیارانەی دەربارەی نهێنیەکانی گەردوون دەیزانێت ، نازانێت دوای ئەو ساتەی ئێستا تیایەتی چی لێ ڕوودەدات! هەرگیز ناتوانێ بە کەرەستەی زانیاریەکان بزانێت پاش ساتێکی تر چی بەسەر دێت ؟ یا ئایا ئەو هەناسەیەی کە لە

دەمیـــەوە هاتـــەدەرێ بـــۆ جـــارێکی تـــریش دێتـــەوە دەرێ یـــاخود ئـــەوە دوا هەناســـەی بـــوو؟ ئەمـــە نموونەیـــەك بـــوو لـــەو غەیبـــەی کـــە لـــە ئـــادەمیزاد شـــاردراوەتەوە ، چـــونکە ناچێتە نێـو پێویـستیەکانی جێنـشینیی، نـەك هـەر ئەوەش بـەڵکو لەوانەیـە ببێتـە کۆسـپێك گـەر بـۆ مرۆڤـ ئاشـکرا بکرایـە! ئـیتر زۆرنموونـەی تـریش هەیـە لـەو نهێنیانـەی کـە لـە مرۆڤـ شـاردراونەتەوەو لـە دووتوێی غەیبدایە و تەنها خوای گەورە خۆی ئەیزانێت .

ئیتر هیچ پێویست بەوە ناکات مرۆڤـ بیری خۆی پێوە خەریك بکات ، چونکە ئەو کەرەسەو ئامرازانەی نەراوەتێ کە یارمەتی بدات بۆ گەیشتن بەو نیازەو هەر هەوڵێك بدرێت لەم بوارەدا بەفیرۆ دەڕواو بێ بەرهەم و بێ سوود دەبێت .

جا ئەگەر بیری مرۆڤـ ئەو توانایەی نەدرابێتێ تا ئەم غەیبە نادیارو شـاراوەیە بزانێـت ، ئیتر ئەمە ئەوە ناگەیێنێت کە مرۆڤـ باوەڕ بەو ڕاستیە شاردراوانە نەهێنێت و، کەللەڕەق بێت بەرامبەریان. چونکە باوەڕ نەبوونیش بڕیارێکە پێویست بە زانیاری دەکات وە زانینیشیان لێرەدا لە سنوری هزرو بیردا نیەو، لە توانای کەرەستەکانی بەدەرەو لە ئەرك و فەرمانەکانیشیدا هیچ پێویـستی پێیـان نیـە ، خـۆ بـە دەسـتەوەدانیش بـۆ ئەندێـشەو ئەفسانەکان زیـانێکی گەورەی هەیـە ، بەڵام لـەوە زیـان بەخشترو سامناکتر ، گوێنـەدان و باوەڕنەبوونە بەکارە نادیارەکان و بە هـیچ نەزانینی غەیبیەکانـە تـەنها لەبەر ئـەوەی توانـای تێگەیشتنیمان نـەبێت... کـە ئەمـە نسکۆیەکە بەرەو جیهـانی ئـاژەڵان ، ئـەو جیهانـەی تـەنها شـتە هەسـتپێکراوەکان تیایانـدا دەژی ، ئـەو ژیانەی لە دیوارەکانیەوە ئاودیوو نابن بەرەو بوون و گەردوونی سەربەست و ئازادو بەرفراوان .

کەواتـە بـا ئـەو کـارە غـەیب و نادیارانـە واز لێبێـنین بـۆ خاوەنەکـەی خۆیان ، ئەوەندەمان بەس بێت کە بۆمان دەگێڕێتەوەو باسیان لێدەکات. بەو

هەندەی کە لە ژیانماندا کەڵکی لێوەربگرین و، ڕەو ڕەوەی گوزەرانمانی پێ هەڵسوڕێ ، با ئەو لایەنانە وەربگرین لە چیرۆکەکەدا کە ڕاستیە گەردوونی و مرۆڤایەتیەکانی تیا ئاشکرا دەبێت و، ئەو دیدو بۆچوونانەی باس دەکات دەربارەی بوونەوەرو پەیوەندیەکانیان ، با هەر ئەوەندەمان بەس بێت کە لە سروشتی مرۆڤ و ڕەفتارو بەهاو نرخەکانی تێبگەین... چونکە هەر ئەو ڕاستیانە بەسوودن و قازانجیان هەیە بۆ ڕێنمایی کردنی مرۆڤایەتی.

وا لێرەداو زۆر بە کورتی کە بگونجێت لەگەڵ سێبەری قورئاندا ، بەخێراییەکی دامێنگیر تێدەپەڕین بەسەر ئەو سروشت و بۆچوون و ڕاستیانەدا.

دیارترین سرووشتی بەسەرهاتی ئادەم ـ وەك لەم شوێنەدا باس دەکرێ ـ ئەو نرخ و بەها گەورەیەیە کە بۆچوونی ئیسلامی ئەیدات بە مرۆڤ و بەو ڕۆڵەی هەیەتی لەسەر زەوی و، بەو شوێنەی داگیری دەکات لە یاسای بوون و، ئەو بەهایانەش کە شتەکانی پێ هەڵدەسەنگێنێت. هەروەها بەهای ڕاستیی ئەو بەڵێنەی دابووی بە خوای مەزن و، ڕاستیی ئەو بەڵێنەی بووە بناغەی جێنشینیەکەی لەسەر زەوی.

ئەو بەهاو نرخە بڵندەی کە بۆچوونی ئیسلامی ئەیدات بە مرۆڤ لەو ئاگاداریە بالآیەی کە خوای گەورە بانگەوازی بۆ کرد لە نێو ئەو دەستە پاکژو پیرۆزەدا دەردەکەوێت ، کە مرۆڤ بۆ ئەوە دروست کراوە تا ببێت بە جێگری خوا لەسەر زەوی ، لەوەشدا دەردەکەوێت کە فریشتەکان فەرمانیان پێ کرا کڕنووشی ڕێز ببەن بۆ ئادەم ، هەروەها لە دەرکردنی ئیبلیسیشدا دەردەکەوێت ، ئەو ئیبلیسەی کە لووت بەرزی و کەللە ڕەقی نواند وە هەر لە سەرەتاوە لە چاودێری کردنی ڕاستەوخۆی خوای گەورەدا دەردەکەوێت کە بەم مرۆڤە ڕێزدارەی بەخشی...

لەم تێڕوانینەوە بۆ خودی مرۆڤ کۆمەڵێك ڕاستیی گران بەها ئاشکرا ئەبێت کە زۆر گرنگن لە جیهانی بۆچوون و جیهانی واقعیشدا.

یەکەمینیان ئەوەیە کە مرۆڤ سەرداری ئەم زەویەیە ، هەر لە پێناوی ئەویشدا ئەو هەموو شتانەی بۆ دروست کراوە ـ وەك لەمەوبەر باس کرا ـ کەواتە خودی مرۆڤ لە هەموو شتێکی ماددی بەرزترو ئازیزترو بەڕێزترەو، لە هەموو بەهایەکی سەر ئەم زەویەش بەنرخترە ، هەرگیز نابێت ملکەچ و کەم دەسەڵات بێت لە پێناو دابین کردنی بەهایەکی ماددی یاخود هەر شتێکی ماددی ... هەرگیز ناشێ یەکێك لە بنەما پیرۆزەکانی مرۆڤایەتی بە چاوێکی کەم تەماشا بکرێت یا دەستدرێژی بکرێتە سەرو، نابێ هیچ بەهایەکی ئەم مرۆڤە بەبێ نرخ سەیر بکرێ لە پێناو ئەنجام دانی دەستکەوتێکی ماددی ، یا بەرهەمێکی ماددی و یاخود زیادکردنی تۆخمێکی ماددی ـ چونکە ئەم شتە ماددیانە سەرجەم لە پێناو مرۆڤدا بەدیهێنراون ، یا دروست کراون ـ یا لە پێناو دابین کردنی مرۆڤایەتی ئەودا داهێنراون و لە پێناو بڕیاردانی بوونی ئادەمیی ئەودا دروست کراون ، کەواتە نابێت نرخی ئەم شتانە ئەوە بێت کە بەهایێك لە بەها مرۆییەکانی مرۆڤ کەم بکاتەوە ، یاخود یەکێك لە بنەماکانی پیرۆزی ڕێزو نرخی ئەم مرۆڤە کەم بکرێتەوە .

دووەمین ڕاستیش ئەوەیە کە ڕۆڵی مرۆڤ لەسەر زەوی سەرەکی ترین ڕۆڵە. چونکە هەر ئەوە کە توانای گۆڕین و لابردنی شێوەو پەیوەندیەکانی هەبێت ، وە هەر ئەویشە کە ئاڕاستە یان دەکاوجوڵەکانیان دیاری دەکات ، نەك کەرەستەکانی بەرهەم هێنان یاخود جۆری دابەشکردنیان ، کە دەسەڵاتی ڕابەریکردنی مرۆڤیان دڕابێتێ و مرۆڤیش بە ملکەچی و بێ دەسەڵات دوایان بکەوێت ، وەك لە بیرو عەقیدە ماددیەکاندا باس دەکرێ کە ڕۆڵی مرۆڤ زۆر بە کەمی و بەبێ نرخ سەیر دەکرێت. بە پێچەوانەشەوە ڕۆڵی ئامێرو کەرەستەکان گەورە دەکرێت و پیرۆز دەکرێت !

لە دیدی قورئانی پیرۆزەوە مرۆڤ بەو جێنشینیەی هەیەتی لەسەر زەوی ، دەبێتە هۆکارێکی ئێجگار گرنگ لە یاسای گەردووندا، شوێنێکی زۆر دیاری هەیە لەو یاسایەدا. چونکە ئەو جێگیریەی هەیەتی لەسەر زەوی بەندە بە چەندین شتی ترەوە. بەندە بە ئاسمانەکان ، بە باو بە باران و، بە خۆرو بە ئەستێرەکانەوە...هەر هەمووشیان وا نەخشەکێشراون و ئەندازە دراون کە بگونجێن و یاریدەدەربن بۆ ئەنجامدان و بەردەوام بوونی ژیان لەسەر زەوی ، تا مرۆڤ بتوانێت جێنشینیی خۆی بە باشی بەڕێوە ببات ... جا ئیتر چ بەراوردێك هەیە لە نێوان ئەم ئەرکە پیرۆزو گەورەیەو ئەو ڕۆڵە کەم و بێ نرخەی کە بیروباوەڕو عەقیدە ماددیەکان ئەیدەن بە مرۆڤ و ڕێنادەن لەو سنورە تەسکە دەربچێت ؟!

بێگومان دیدو تێڕوانینی ئیسلام یاخود ماددیەت بۆ مرۆڤ کاردەکاتە سەر سرووشتی ئەو یاسایەی کە هەریەکەیان دایدەنێن بۆ خودی مرۆڤ و، کاردەکەنە سەر ڕێزلێنانی بنەماکانی مرۆڤایەتی، یاخود بەکەمزانینی بەهاکانی ، هەروەها کاردەکەنە سەر چۆنیەتی ڕێزلێنان یا نرم کردنەوەی بەهاکانی ئەم مرۆڤە... ئەوەی لە جیهانی ماددیەتیشدا ئەیبینین لەو هەموو بێ بایەخیەی ڕووی کردۆتە سەربەستیی مرۆڤ و بنەماو شتە پیرۆزەکانی لە پێناو دابین کردنی بەرهەمی ماددی و زیادکردنیاندا، ئەمانە سەرجەم کاریگەریەکن لەکاریگەریەکانی ئەو دیدو بۆچوونەی هەیەتی بەرامبەر بە ڕاستیی خودی مرۆڤ و ڕاستیی ئەو ڕۆڵەی ئەیبینێت لەسەر زەویدا !

لە بەرامبەر ئەوەداو لە ئەنجامی ئەو دیدو بۆچوونە پیرۆزەی ئیسلام هەیەتی بۆ ڕاستیی مرۆڤ و ئەو ئەرکە مەزنەی لەسەرشانیەتی، ئەبینین بەها ڕەوشتیەکانی زۆر بڵندو بەرزن ، چ لە کێش و چ لە بەهایاندا و ڕەفتارو ئاکارە جوانەکانیشی پێ بەرز ئەبێتەوەو نرخی باوەڕو ڕەوشت جوانی و دڵسۆزیی لە ژیانیدا بڵندو گەورە دەکات. ئا ئەمانەن ئەو بەهایانەی پەیمانی

جێنشینیەکەی پێوە بەندن : ﴿ فإما يأتينكم مني هدى فمن تبع هداي فلا خوف عليهم ولاهم يحزنون ... ﴾ ئەم نرخ و بەهایانەش بەرزترو بەڕێزترن لە سەرجەم بەها ماددیەکان ـ لەگەڵ ئەوەشدا کە مانای جێنشینی ئەوەیە کە ئەو بەها ماددیانەش بەدەست بهێنرێن ، بەڵام نەبنە ڕەگ و ریشەو شتی سەرەکی و زاڵ نەبن بەسەر بەها باڵاکاندا ـ ئەم دیاردەیەش کێشی خۆی هەیە لە ئاراستەکردنی دڵ و دەروونی ئادەمیزاددا بەرەو پاکژی و بڵندی و خاوێنی لە ژیاندا. بە پێچەوانەی بیرو بەرنامە ماددیەکان کە گاڵتەجاڕیە بە سەرجەم بەها ڕۆحیەکان و بەفیڕۆدانی هەموو بەها ڕەوشتیەکانە ، تەنها لە پێناو بەرهەم هێنان و دابینکردنی شمەك و پێویستیەکانی گەدەو ڕیخۆڵە (ئاژەڵ ئاسا هەر ورگ پڕکردن بێ )[1].

لەبۆچوونی ئیسلامیدا ویستی مرۆڤ بە نرخ و بڵندە ، چونکە بەو ویستە پەیمانەکەی لەگەڵ خوادا بۆ ئەچێتە سەرو هەر بەویش ئەرکەکانی سەر شانی جێبەجێ دەکات و پاداشتی لەسەر ئەدرێتەوە... ئەتوانێت لە پلەو پایەی فریشتەکانیش زیاتر بەدەست بێنێ کاتێ کە پارێزگاری لەو پەیمانە دەکات کە لەگەڵ خوای گەورەدا بەستویێتی، لە ڕێگەی توندکردن و چاکردنی ویستەکانی و، سەردانەواندن بۆ ئارەزووەکانی و، سەربڵندی بەسەر ئەو فریودانەی ئاراستەی دەکرێت. بەلام ئەشتوانێت خۆی سەرگەردان بکات و لەو بەرزیەوە خۆی بەرەو نزمی ببات ، کاتێ کە ئارەزووەکانی زاڵ بکات بەسەر پەیمانەکەی خوای خۆی و لەبیری بچێتەوە ، ئەمەش بێ گومان یەکێکە لە دیاردەکانی ڕێزلێنان ، کە دەچێتە پاڵ ڕێزەکانی ترو، بریتیشە لە بیرهێنانەوەیەکی بەردەوام بۆ دوو بڕیاردانی نێوان بەختیاری و سەرگەردانی

---

[1] بڕوانە کتێبی: (الانسان بين المادية والاسلام) ، محمد قطب ـ دار الشروق .

و، بڵندبوون و هەڵدێرو، پایەی مرۆڤــی خاوەن ویست و خواست و، نێوان ڕێڕەوی ئاژەڵیی لغاوکراو!

لە ڕووداوەکانی ئەو جەنگەی چیرۆکەکە نەیانگێڕێتەوە لە نێوان مرۆڤـ و شەیتاندا. بەردەوام سرووشتی ئەو جەنگە وەبیردەهێنێتەوە کە لە نێوان پەیمانی خواو فریودانی شەیتاندایە ، نێوان باوەڕو بێ باوەڕیدایە ، نێوان ڕەواو ناڕەوا دایە ، نێوان ڕێنمایی و گومڕاییدایە. مرۆڤــیش خودی خۆی گۆڕەپانی جەنگەکەیە ، هەرخۆشی براوە یاخود دۆڕاوە لەو گۆڕیانەدا!

لە کۆتاییدا بیرۆکەی ئیسلام دێت دەربارەی گوناهکردن و پەشیمان بوونەوە. گوناهکردن کارێکە تاکە کەسێك ئەنجامی ئەدات و پەشیمان بوونەوەش هەر بەو جۆرەیە، لە بۆچوونێکی ڕوونی ئاشکرای سادەی بێ گرێ و بەبێ هیچ ئاڵۆزیەك. هیچ گوناهێك نیە سەپێندرابێت بەسەر مرۆڤدا پێش لە دایك بوونی ــ هەروەك بیرۆکەی کڵێسە وا ئەڵێ ــ هیچ پاکبوونەوەیەکی یەکجارەکیش نیە بۆ ئەو گوناهە، وەك کڵێسە ئەڵێ کە عیسا ـ سەلامی خوای لێبێت ـ ( گوایە کوڕی خوایە) و بە لە خاچدانی ئەو هەموو ئادەمیزاد لە گوناهەکەی ئادەم پاکبوونەوەو ڕزگاریان بووە!... نەخێر گوناهەکەی ئادەم تەنها گوناهی خودی خۆی بوو، پاکبوونەوەشی بە پەشیمان بوونەوەی ڕاستەوخۆ بوو، زۆر بە ئاسانی و سادەیی گوناهی هەریەك لە نەوەکانیشی گوناهێکی تاکە کەسیە، ڕێگاش ئاوەڵایە بۆ پەشیمان بوونەوە ، زۆر بە ئاسانی و سادەیی... ئەمە چەند بۆچوونێکی جوان و ئاشکرایە. کە هەر مرۆڤێك خۆی بەرپرسیارە لە هەڵەکانی خۆی ، ئەمەش وا لە هەر مرۆڤێك دەکات لە هەوڵدان و کۆششدابێت و هەرگیز دەستەژنۆ دانەنیشێ و نائومێد نەبێت... ﴿ إن الله تواب رحيم ﴾...

ئەمە چمکێك بوو لە سرووشەکانی چیرۆکی ئادەم ـ لەم شوێنەدا ـ هەر ئەوەندە بەسە لەژێر سێبەری قورئاندا، کە هەر خۆی بە تەنها سامانێکە

له ڕاستیی و له بۆچوونه دروستەکانیدا، سامانێکه له سرووش و ئاڕاسته پیرۆزەکـان ، سـامانێکه کـه بناغـەی بۆچـوونه کۆمەڵایـەتی و دۆخـه کۆمەڵایەتیەکانی لەسەر بەندە ، ڕەوشتی بەرزو چاکەخوازی و ئاکاری جوان بەرێوەیان دەبات. لەم چمکەوە ئەتوانین گرنگی چیرۆکەکانی قورئانمان بۆ دەربکـەوێت لـه چـڕو پڕکردنـی بناغـەکانی بۆچـوونی ئیـسلامی و، ڕوونکردنـەوەی ئەو بەهایانەی لە سەری وەستاون ، کە بەهایەکن شایانی ئەوەن لە خوای تاکو تەنهاوە دەرچووبن و بەرەو ئەویش هەنگاو بنێن ، لە کۆتاییشدا هەر بۆ لای ئەو بچێتەوە. بەڵگەنامەی جێنشینیەکەش لەوەدایە کە ڕێنمایی لە خواوە وەبگیرێ و پابەند بێ بە ڕێبازی ئەوەوە لە ژیاندا، دوو ڕیانیش لە گوێ گرتن و گوێ ڕایەڵی مرۆڤدایە بۆ ئەو فەرمانانەی لە خواوە بۆی دێت ، یاخود مرۆڤ گوێ گرو گوێ ڕایەڵی فەرمانەکانی شەیتان بێت. ئیتر ڕێگای سێیەمینیان نیە... یا خوای گەورە یاخود شەیتان. یا ڕێنمایی یاخود گومڕایی. یاڕەوا یاخود ناڕەوا. یا سەرکەوتن یاخود دۆڕان... ئەم ڕاستیانەش ئەوەیە کە سەرجەم ئایەتەکانی قورئان ئاماژەیان بۆ ئەکات و دەریان دەبڕێ ، ئەمەش یەکەمین ڕاستیە کە هەموو بۆچوونەکانی تری لەسەر بەندەو، هەموو هەلومەرجەکانی جیهانی مرۆڤیان پێوە بەستراوە :

﴿ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اذْكُرُواْ نِعْمَتِيَ ... وماالله بغافل عما تعملون ﴾

هەر لەم بڕگەیەوە لە سورەتەکەدا ڕەوتەکە ڕووبەڕووی بەنی ئیسرائیل ئەبێتـەوە ، ئەوانـەی لـە شـاری مەدینـە زۆر بـە خراپـی و دژواری بـەرەنگاری بانگەوازەکە بوونەوەو بە ئاشکراو بە نهێنی ڕێیان لێدەگرت . ئەم کارەشیان لـەو سـاتەوەی کـە ئیـسلام لـە مەدینـەدا سـەریهەڵدا دەسـتی پێکـردو تـەنها سـاتێکیش نەوەسـتا. ئـەوەیان لا ڕوون بـوەوە کـە بـە هیـوای دەسـەڵات و سـەروەریەو، ئـەمانیش دوورئەخاتـەوە لـەو سـەرۆکایەتیە کۆمەڵایـەتی و ئابووریەی کە هەیان بوو، لەو کاتەوەی کە ئەوس و خەزرەج یەکیان گرتەوە،

لەو کاتەی ئەو کەلێنانە پڕبوونەوە کە جوەکان بە هەلیان وەرئەگرت و پیلانیان تیادەگێڕا، وە بەرنامەو ڕێسایەکی سەربەخۆی بۆ داڕشتن کە لەسەر بنچینەی پەرتووکە نوێیەکە داڕێژرابوو... ئەو جەنگەی جوەکان بەرپایان کرد دژی ئیسلام و موسوڵمانان بە درێژایی مێژوو تا ئەم ساتەی ئێستا تێیدان هەر بەردەوامەو سارد نەبۆتەوە ، بە هەمان کەرەسەو، هەمان شێوازە ، تەنها ڕواڵەتی نەبێت ئیتر هیچ نەگۆڕاوە بەلام ناوەڕۆکەکەی هەروەکو خۆیەتی و، سرووشتەکەی یەك چەشنە، هاوکات لەگەڵ ئەوەشدا ئەم جولەکانە لە هەر شوێنێك بوونایە خەڵکی ڕاویان دەنان و دەریان ئەکردن و پەت پەتێنیان پێ ئەکردن لەم لا بۆ ئەو لاو لەم سەدە بۆ ئەو سەدە ئەوە چارەنوسیان بوو، وە هیچ باوەشێکی نیانیان نەهاتە ڕێ کە لە ئامێزیدا کەمێك بحەوێنەوە ، تەنها لە جیهانی ئیسلامیی بەرفراواندا نەبێت ، ئەو جیهانەی ڕازی نیە لە چەوسانەوەی ئایینی و ڕەگەزایەتی و، دەرگاکانی ئاوەڵایە بۆ هەموو کەسێکی ئاشتیخواز کە ئازاری ئیسلام نەداو پیلان نەگێڕێ و دژایەتی موسوڵمانان نەکات!

واش چاوەڕوان ئەکرا کە جوەکانی شاری مەدینە یەکەمین کەس بن باوەڕ بەو پەیامە نوێیە بهێنن و باوەش بۆ پێغەمبەرە نوێیەکە بگرنەوە ، لەو کاتەوە کە قورئان بە گشتی دانی نا بە ڕاستی ناوەڕۆکی تەوراتدا، لەو کاتەوەی کە ئەیانزانی کاتی پەیامەکەی ئەو پێغەمبەرە نزیك بۆتەوەو، ئەو سیماو نیشانانەیان بۆ باسکرابوو کە وەك موژدە لە پەرتووکەکەیاندا تۆمارکرابوو هەر خۆشیان بۆ خەڵکانی عەرەبی هاوبەش پەیداکارانیان دەگێڕایەوەو موژدەیان ئەدانێ بە هاتنی ئەو پێغەمبەرە نوێیە!

ئەم وانەیە بەشی یەکەمی ئەو باسە فراوانەیە لەگەڵ بەنی ئیسرائیل، بەڵکو ئەو هێرشە گەورەیەیە کە هەڵوێست و پیلانەکانیان ئاشکرا دەکاو پەردەیان لەسەر هەڵئەداتەوە ، دوای بێ هوودەیی گشت شێوازەکانی

بانگـەوازکردنیان بـۆ هاتنـە نـاو ئیـسلامەوە تـا ببنـە ئەنـدام لـە کـاروانی باوەڕدارانی ئەم ئایینە نوێیەدا.

*    *    *

ئـەم وانەیـە بـە بانگـەوازێکی مـەزن و بڵنـدوپیرۆز بـۆ بـەنی ئیـسرائیل دەست پێ دەکات ، نازو بەهرە بێ وێنەکانی خوای گەورەیان بیر دێنێتەوەو بانگیان ئەکات تا پەیمانەکەیان ببەنەسەر تا ئەویش ئەو بەڵێنەی پێی دابوون بۆیان جێبەجێ بکات و، بانگیان دەکات تا لێی بترسن و سنورەکانی بپارێزن .. کە وەك پێشەکیەك بۆ بانگکردنیانە بۆ باوەڕهێنان بەو پەیامەی ناردۆێتی ، ئـەو پەیامـەی کـە بـاوەڕ بـە پەیامەکـەی ئـەوانیش دێنـێ و نارازیـە لـەو هەڵوێستەی وەریانگرتووە بەرامبەری و نارازیە لە دەستپێشخەریان لە باوەڕ نەهێنان و پشتکردنیان لەو پەیامە پیرۆزە ، هەروەها نـارازی و توورەیە لەو چەواشـەکاریەی کردیـان و ڕەواو نارەوایـان تێکـەڵی کـردوو ئـەوەی ڕاسـت و ڕەوایە ئەیشارنەوە تا خەڵکی ـ بە تایبەتی موسوڵمانەکان ـ چەواشـە بکـەن و دووبەرەکی و جودایی بخەنە نێو ڕیزەکانیانـەوەو، گومـان و دوودڵـیش بخەنـە نێو دەروونی ئەوانەی تازە ئەچنە ژێر ئاڵای ئاینـە نوێیەکـەوە . وە فـەرمانیان پێدەکات تا بچنە ناو ڕیزەوەو ئیتر دەست بکـەن بـە نوێـژکردن و زەکـات دان و هاوشـانی موسـوڵمانان کڕنـووش ببـەن و بەسـەر دڵ و دەروونـی خۆیانـدا زاڵ بن و ڕایـانبێنن لەگەڵ ئاینـە نوێیەکـەدا ئاشـنا ببـێ و یـەکبگرێ ئـەویش بـە ئارامگرتن لە سەر نوێژ کردن . هەروەها نارازیە لەوەی کە هاوبەشـپەیداکاران بانگەواز دەکەن بۆ باوەڕهێنان بەڵام لە هەمان کاتیشدا خۆیان باوەڕ نـاهێنن و نایەنە نێو ئاییـنی خواوەو موسوڵمان نابن!

پاشان دەست ئەکات بە بیرخستنەوەی ئەو نازو نیعمەتەی بە درێـژایی مێـژوویان خـوای گـەورە پێـی بەخـشیون و، بـە شـێوەیەك گفتوگۆیـان لەگەڵدا دەکات کە ئەمانیش هەر ئەوانەن کە لە کاتی موسا پێغەمبەر ـ سەلامی خوای

لێبێت ــ ئەو ئازو بەهرانەیان وەرگرتبوو، چونکە ئەوان یەك نەتەوەن و نەوەکانیان یەکدەگرنەوەو یەك ڕەوشتیان هەیە. لە ڕاستیشدا هەروان و هەڵوێستەکانیان بەدرێژایی ڕۆژگار ئەم ڕاستیەی سەلماندووە!

وە بەو ڕۆژە ئەیانترسێنێت کە شایانی لێترسانە!... ڕۆژێکە کەس بە هانای کەسەوە نایەت و، نابێ کەس بۆ کەس بپاڕێتەوەو داوای لێخۆشبوونی بۆ بکات و، هیچ کەس لە بری گوناهەکانی شتی تری لێوەرناگیرێ بۆ پاکبوونەوەی و، کەسیش نیە بتوانێت لە ئازارو ئەشکەنجەی ئەو ڕۆژە سەختە بیانپارێزێت .

هەروەها دیمەنی ڕزگاربوونیان لە دەستی فیرعەون ئەخاتەوە پێش چاویان و هەستیان ئەبزوێنێ هەروەك بڵێی ئا ئێستا ڕوویداوە، هەروەك چۆن دیمەنی بەخششە بەردەوامەکانی تریشیان بە بیر دێنێتەوە، وەك دیمەنی سێبەر بۆ کردنیان بەو پەڵە هەورانەی ئاسمان و ناردنە خوارەوەی گەزۆی شیرین و باڵندەی (سەلوا) و هەڵقوڵانی ئاوی بن بەردەکان... پاشان ئەوەیان بیر دەخاتەوە کە دوای ئەو هەموو چاکەو بەخششانە ئەوان لایان داو خراپەیان ئەنواند، هەر ئەوەندە لە خراپەیەك ئەیگێڕانەوە بەدکاریەکی تریان ئەکرد، هەر ئەوەندە لە گوناهێکیان خۆش دەبوو گوناهێکی تریان دەکرد، تا لە هەڵەنووتێك ڕزگاریان ئەبوو دەکەوتنە چاڵێکی ترەوە... دەروونیشیان هەر وەکو خۆیەتی و نەگۆڕاوەو هەروا خوارو خێچ و ڕەقە و بەردەوامە لەسەر لاری و لادان، هەروەها هەمان دەروونە لە لاوازی بەرامبەر هەڵگرتنی ئەرکەکانی و، نکوڵی کردنی لە هەڵگرتنی ڕاسپاردەکانیان و پەیمان شکاندنیان چ لەگەڵ خوای گەورەو چ لەگەڵ پێغەمبەرەکانیشیاندا. تا ئەو ڕادەیەی کە بەبێ هیچ گوناهێك و زۆر بە ناڕەوایی پێغەمبەرەکانیان ئازار ئەداو دەیانکوشتن و پشتیان ئەکردە ئایەتەکانی خواو باوەڕیان پێ نەدەهێنا، یا گوێرەکەیان دەپەرست و کاری نابەجێیان بەرامبەر خوای گەورە

دەکردو باوەڕیان بە پێغەمبەرەکانی نەدەهێنا تا خوای مەزن بە چاوی خۆیان نەبینن ، ئەوەش کە خوا فەرمانی پێ ئەکردن گوێڕایەڵی نە ئەبوون کاتێ کە چوونە ناو گوندەکەوەو خراپەکاریان دەنایەوەو ئەوەی فەرمانیان پێکرابوو بەجێیان نەدەهێناو، لە ڕۆژی شەممەدا سنووریان ئەبەزاندو، پەیمانی (الطور)یان شکاندو، بێنەوبردەو ساردو سڕیان دەنواند لە کێشەی سەربڕینی ئەو مانگایەی کە خوای گەورە بۆ مەبەستێکی تایبەت فەرمانیدا بەسەربڕینی...

هەر لەگەڵ ئەم ڕەوشتانەشیاندا وایان دائەنا کە هەر خۆیان ڕێنماییان دۆزیوەتەوەو ڕێگا ڕۆشنن و، هەر ئەوان خوا لێیان ڕازیەو هەموو ئاینەکانی دی پووچەڵەو جگە لە خۆیان سەرجەم نەتەوەکانی دی گومڕاو سەرگەردانن! بەڵام قورئانی پیرۆز لەم بەشەیدا سەرجەم ئەو بۆچوونانەیان پووچەڵ دەکاتەوەو بڕیاری ئەوە ئەدات کە هەرکەس باوەڕی بە خواو ڕۆژیی دوایی هەبێ و، کردەوەی چاکی ئەنجامدا لە هەر نەتەوەو خێڵێك بێ، ئەوانە پاداشتی خۆیان لای پەروەردگاری خۆیانەو هیچ ترسیان نیەو دڵتەنگیش نابن لەڕۆژی دواییدا..

* * *

ئەم هێرشە ـ ئەوەی لەم وانەیەدا هاتووە یاخودئەوەی لە ڕەوتی سوورەتەکەدا لەمەودوا دێت ـ زۆر پێویست بوو کە پێش هەموو شتێك بکرایە بۆ پوچەڵ کردنەوەی داواکانی جولەکەکان و، ئاشکرابوونی پیلانە گلاوەکانیان و، دەرخستنی ناوەرۆکی ئەو فڕوفێڵ و پیلانگێڕیەی دەیانگێڕا لە دژی ئیسلام و موسوڵمانان... هەروەها زۆر پێویست بوو بۆ زیاتر کرانەوەی چاوو دڵی موسوڵمانەکان بەرامبەر ئەو هەموو پیلان و فێڵبازیەی کە لە کۆمەڵگای نوێیاندا بەرامبەریان دەکراو بەرامبەر ئەو بناغانەی کە

لەسەری جێگیر بووبوون، یا بەرامبەر یەکێتی ڕیزی موسوڵمانان دەکرا بۆ تێکدان و بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندەی خراپ و دووبەرەکی نانەوە لە ناویاندا.

لە لایەکی تریشەوە ئەم هێرشە پێویست بوو بۆ هۆشیار کردنەوەی موسوڵمانان لەو هەڵدێرانەی کە نەتەوەی جێنشینی پێشووتر تووشی هاتبوون و بووە هۆی لە دەستدانی پایەی بەرزی جێنشینیان و پلەی بەرزی پاراستنی ڕاسپاردەی خوای گەورەیان لەسەر زەوی نەدرایەو، بێ بەری بوون لە هەڵگرتنی بەرنامەی خوا بۆ ڕابەرایەتی مرۆڤایەتی، ئەم هێرشەش چەندین ئامۆژگاری دیارو شاراوەی بۆ موسوڵمانان لە ئامێز گرتووە. هەر بۆ وریاکردنەوەیان لەو هەڵدێرانە هەروەك لە بەشی دووەمدا باسدەکرێت.

کۆمەڵگای موسوڵمان لە شاری مەدینەداو لەو کاتانەیدا پێویستیەکی زۆریان بەو ڕێنمایانە بوو. نەك هەر ئەوان بەڵکو نەتەوەی موسوڵمان لە هەموو کاتەکانیاندا دەبێ ئاگایان لەو ئامۆژگاری و ڕێنماییانە بێت و بە چاوێکی زۆر کراوەو هەستێکی وردبینەوە لە قورئان بکۆڵێتەوە، تا بتوانێت ڕێنماییەکانی سەروەریی پەروەردگاریی بەرزو پیرۆز باش وەربگرێت و تا ئامادەبێت بۆ ئەو جەنگانەی لە دژی دوژمنە ئاساییەکانی بەرپا دەبێت و، تا بزانێت چۆن پیلانە گلاّوو دژوارەکانیان پووچەڵ دەکاتەوە، کە بە شاراوەترین شێوەو فێڵاوی ترین شێواز ئاراستەیان ئەکرێت. دڵێکیش کە ڕوناکیی بیرو باوەڕی وەرنەگرتبێت و، ئامۆژگاری لەوسەرکردایەتیە وەرنەگرێت کە بە ئاگاو شارەزایە لە نهێنی و ئاشکراو دیارو نادیار ، هەرگیز ناتوانێت ئەو ڕێگا خراپ و فێڵاویە نادیارانە بناسێتەوە کە دوژمنەکان دەیگرنەبەرو پیلانەکانیانی تیا ئاراستەی ئەمان دەکەن...

پاشان لە ڕوانگەی گونجانی هونەری و دەروونیەوە لە نواندنی قورئانیدا ، ئەبینین کە سەرەتای ئەم بەشە بە کۆتایی چیرۆکی ئادەم و بەو

سرووشتانەی کە ئاماژەمان بۆ کرد بەندەو یەکدەگرێتەوە. ئەمەش لایەنێکە لە دروستیی ڕەوتی قورئانیی لە نێوان چیرۆکەکان و ئەو ناوەندەی تیایاندا باسدەکرێ.[1]

لەمەوبەر ڕەوتەکە بڕیاری ئەوەی دا کە خوای گەورە سەرجەم بەرهەمەکانی سەر زەوی بۆ خزمەتی مرۆڤ دروست کردوە . هەروەها باسی چیرۆکی جێنشینی ئادەم دەکات بە پێی پەیمانێکی ڕوون و ورد لە خواوەو ڕێزلێنانی زیاتر لە فریشتەکان و، ئامۆژگاری و بەڵێن و لەبیر چوونەوەشیان و، پاشگەزبوونەوەو پەشیمانی و، ڕێنمایی و لێخۆشبوون، زانین و فێربوونی یەکەمین ئەزموون لە ململانێی بەردەوامی سەرزەوی لە نێوان هێزی شەڕو خراپەکاری و تێکدان بە نوێنەرایەتی ئیبلیس و لە نێوان هێزی خێرو چاکەخوازی و بنیاتنان بە نوێنەرایەتی مرۆڤی خاوەن ئیمان و باوەڕ.

ڕەوتەکە لەم سورەتەدا باسی لەم هەموو شتە کردوە، پاشان و یەکسەر لە بەشێکی تریدا باسی بەنی ئیسرائیل دەکات ، باسی ئەو پەیمانەی کە لەگەڵ خوای گەورەدا بەستیان و نەیانگەیاندەسەر، ئەو نازو بەهرانەی بۆی ناردبوون و دانیان پیانەناو بێ منەت بوون لێی. هەر لەبەر ئەو ڕەفتارانەشیان بوو کە خوای گەورە بێ بەشی کردن لە پایەی جێنشینیی خۆی و، تاماویشن سەرشۆڕیی بۆ بڕیاردان و، موسوڵمانەکانی هۆشیار کردەوە لە پیلانگێڕانیان و لەو چاڵانەی کە بۆ خەڵکی هەڵدەکەنن... بۆیە پەیوەندیەکی دیارو ئاشکرا هەیە لە نێوان چیرۆکی جێنشینی ئادەم و جێنشینی بەنی ئیسرائیل و، ئەو گونجان و لەیەکچوونەش زۆر ئاشکرایە لە ڕەوت و نواندیاندا.

قورئان لێرەدا بە درێژیی باسی بەسەرهاتی بەنی ئیسرائیل ناکات، بەڵکو بە کورتی یا بە درێژەدانێکی گونجاو ئاماژە بە چەند هەڵوێست و

[1] بروانە ((القصة في القرآن)) لە کتێبی ((التصوير الفني في القرآن)) ((دار الشروق)) .

دیمەنێك دەدات. ئەم بەسەرهاتەش لە هەندێ سورەتی مەکییدا باسکراوە کە لە پێش ئەم سورەتەوە هاتوونەتە خوارێ ، بەلاّم لەوێ لەگەڵ باسی شتی تردا و بە مەبەستی چەسپاندنی ئەو چەند موسوڵمانانەی کە لە شاری مەککەدا بوون و، باسی ئەزموونەکانی بانگەوازو کاروانی بەردەوامی باوەڕو ئیمان دەکات هەر لە یەکەمین ساتی بوونی مرۆڤەوە و ئاراستەکردنی کۆمەڵی موسوڵمانان بە پێی بارودۆخی تایبەتی ئەو کاتەی شاری مەککە. بەلاّم لێرەدا مەبەستەکە ئەوەیە کە لەمەو پێش باسمان کرد لە ئاشکراکردنی ناوەرۆکی نیازەکانی جوەکان و شێوازی پیلانگێڕانیان و هۆشیارکردنەوەی کۆمەڵی موسوڵمان لەو ڕەفتارانە تا وریا بن و ئاگایان لە خۆیان بێت نەبا بکەونە هەمان ئەو هەڵدێرانەی کە جوەکان خۆیان لەوەوپێش تێی کەوتبوون ... وە بە هۆی لە یەکنەچوونی هەندێ لە ئامانجەکانی قورئانی مەکیی و قورئانی مەدەنی شێوەی باسکردنەکەش ئەگۆڕێ ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ڕاستیانەی لێرەو لەوێش پیشاندەدرێ لەمەڕ لادانی بەنی ئیسرائیل و گوناهکاریەکانیان هەریەکەو یەك بابەتی سەربەخۆن (هەروەك لەمەودوا باس ئەکرێت کاتێ کە باس لە سورەتە مەکیەکان دەکرێ، ئەوانەی پێش ئەم سورەتە هاتوونەتە خوارێ).

پێداچوونەوەیەك بەو جێیانەی باسی بەنی ئیسرائیلی تیاکراوە لێرەو لەوێش، ئەوە دەردەخات کە لەگەڵ ئەو ڕەوتەی تیایدا نمایشکراوە دەگونجێ و، تەواوکەری ئامانج و ئاراستەکانیەتی... لێرەشدا لەگەڵ ڕەوتەکەی پێشوویدا گونجاوە. ڕەوتی ڕێزلێنانی مرۆڤ و، ئەو پەیمانەی داویەتی و لەبیرچونەوەکەشی. چەندین ئاماژەشی تیایە بۆ یەکێتی مرۆڤایەتی و، یەکێتی ئایینی خوا ئەو ئاینەی کە ناردیە خوارەوە بۆیان و، یەکێتی پەیامەکانیشی، لەگەڵ دەست خستنەسەرو ئاوڕدانەوە لە دەروونی مرۆڤایەتی و بنەماکانی و، ئاکامی لادانی لەو بنەمایانەی کە جێنشینی

مرۆڤـ لەسەر زەوی پێیانەوە بەندن ، وە ئەو کەسەش کە باوەڕیان پێ ناهێنێ واتە باوەڕی بە مرۆڤــایەتی خۆی نیەو بنەماکانی جێنشینی لە دەستداوەو پاشەو پاش گەڕاوەتەوە بەرەو جیهانی ئاژەڵان!

وە چیرۆکی بەنی ئیسرائیل زۆرینەی ئەو چیرۆکانەیە کە لە قورئانی پیرۆزدا باسکراون و بایەخدان بە باسکردنی هەڵوێست و مەبەستەکانی بە ئاشکرا دیارەو دانایی خوای گەورە دەردەخات لە چارەسەرکردنی کێشەی ئەم نەتەوە موسوڵمانەو، پەروەردەکردنی بۆ ئەو جێنشنیە مەزن و باڵایە... دەبا دوای ئەم کورتەیە بڕوانینە نمایشی دەقە قورئانیەکان :

﴿يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اذْكُرُواْ نِعْمَتِيَ ... ، وانهم إليه راجعون ﴾

ئەوەی تەماشای مێژووی بەنی ئیسرائیل ئەکات سەری دەسوڕمێ لەو هەموو نازو بەخششەی خوای گەورە ڕژاندبووی بەسەریاندا، هەروەها سەری دەسوڕمێ لەو نکوڵیە نەگریس و چەندین جارەی کردیان بەرامبەر ئەو هەموو نازو بەهرەیەی باری بەسەریاندا... ئالێرەدا خوای گەورە بە گشتی ئەو نازو بەهرەیەیان بە بیردێنێتەوە کە پێی بەخشیبوون پێش ئەوەی لەمەودوا بە درێژی باسیان لێبکات: هەرلەبەر ئەوەشە تا لە پاشاندا بانگیان بکات بۆ جێبەجێ کردنی ئەو پەیمانەی بەستبوویان لەگەڵ خوادا ــ سبحانە ــ تا بەخششی زیاتریان بداتێ و گوزەرانیان بە بەردەوامی لە باشبووندا بێت :

﴿ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اذْكُرُواْ نِعْمَتِيَ الَّتِي أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَوْفُواْ بِعَهْدِي أُوفِ بِعَهْدِكُمْ ﴾...

ئەبێ چ پەیمانێك بێت وا لەم جێیەدا ئاماژەی بۆ ئەکرێت ؟ ئایا بەڵێنەکەی یەکەم جارە ؟ بەڵێنەکەی خوای گەورە بۆ ئادەم : ﴿فإما يأتينكم مني هدى ، فمن تبع هداي فلا خوف عليهم ولاهم يحزنون. والذين كفروا وكذبوا بآياتنا أولئك اصحاب النار هم فيها خالدون ﴾ ...؟ یاخود ئەو پەیمانە

گەردوونیەیە کە پێش یەیمانەکەی ئادەم بەسترابوو. ئەو پەیمانەی لە نێوان سرووشتی پاکی مرۆڤـ و (فیترەتی مرۆڤـ)و لە نێوان بەدیهێنەرەکەیدا بەسترابوو: کە خوا بناسێ و تەنها ئەو بپەرستێ، بەبێ هیچ هاوتایەك... ئەمەش پەیمانێکە پێویست بە ڕوونکردنەوە ناکات و پێویستی بە سەلماندنیش نیە ، چونکە سرووشتی پاکی مرۆڤـ زۆر بە ئاسوودەیی و بە پەرۆشەوە بەرەو ئەو مەبەستە هەنگاو ئەنێ و تامەزرۆیەتی و، هیچ شتێك ڕێی لێناگرێ مەگەر هەڵفریوان و لادان نەبێت ؟

یاخود ئەو پەیمانە تایبەتیەیە کە خوای مەزن لەگەڵ (ئیبراهیم)ی باپیرەی ئیسرائیلدا بەستی ، کە لەگەڵ ڕەوتی سورەتەکەدا باسی دەکرێت :

﴿ وإذ ابتلى ابراهيم ربه بكلمات فأتمهن ، قال : إني جاعلك للناس إماما ، قال : ومن ذريتي ؟ قال : لاينال عهدي الظالمين ﴾...؟ یاخود ئەو پەیمانە تایبەتیەی خوا خۆی بڕیاری دا لەگەڵ بەنی ئیسرائیل کاتێ کە کێوی (طور)ی بەرزکردەوە سەرسەریان و فەرمانی پێکردن کە بە توندی پابەندی ناوەرۆکی بەڵێنەکەیان بن. کە لەم بەشەشدا باس دەکرێت ؟

لەڕاستیدا سەرجەم ئەم بەڵێن و پەیمانانە بریتین لە تەنها یەك پەیمان ... پەیمانی نێوان خوای بەدیهێنەرو بەندەکانی ، کەوا بڕیارە بەدڵ و بە گیان گوێڕایەڵی بن و بە هەموو دڵ و دەروونیانەوە مل کەچی بن. ئیتر ئا ئەوە تاکە ئاینەو ئا ئەمەیە ئەو ئیسلامەی سەرجەم پێغەمبەرەکان هێناویانەو، بوو بە ئاڵاو مەشخەڵی کاروانی ئیمان و باوەڕ بە درێژایی سەردەم و ڕۆژگارەکان ... جا وەك پێزانینێك بۆ ئەو پەیمانە خوای گەورە بانگەوازی بەنی ئیسرائیل دەکات کە بەتەنها لەو بترسن و تەنها مل کەچی فەرمانەکانی ئەو بن :

﴿ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ وَأَوۡفُواْ بِعَهۡدِيٓ أُوفِ بِعَهۡدِكُمۡ وَإِيَّٰيَ فَٱرۡهَبُونِ ﴿٤٠﴾ ﴾ البقرة: ٤٠

وەك بە ئەنجام گەیاندنێکی ئەم پەیمانە ، خوای مەزن داوا لە بەنی ئیسرائیل دەکات کە باوەڕ بەو پەیامە بهێنن کەناردوێتی بۆ پێغەمبەرەکەی کە ئەو باوەڕ بە پەیامەکەی ئەوانیش دێنێت ــ هەروا زوو هەوڵی باوەڕ نەهێنان نەدەن و، نەبن بە یەکەمین بێباوەڕانی و یەکەمین دوژمنی ، بەڵکو ئەبوایە ئەوان یەکەمین کەس بوونایە کە باوەڕیان پێ بهێنایە!

﴿ وَآمِنُواْ بِمَا أَنزَلْتُ مُصَدِّقاً لِّمَا مَعَكُمْ وَلاَ تَكُونُواْ أَوَّلَ كَافِرٍ بِهِ ﴾...

ئەو ئایینی ئیسلامەش کە (محمد) (ﷺ) هێناویەتی هەر ئەو تاکە ئاینە نەمرەیە کەبەو شێوە کۆتاییەی هاتە خوارێ و، درێژە دانێکە بە پەیام و پەیمانی خوای گەورە هەر لە سەرەتای مرۆڤایەتیەوەو، هەردوو باڵی لێك دەنێ بەسەر ڕابووردووداو، دەستی مرۆڤایەتی ئەگرێ بەرەو داهاتووش ، هەردوو (پەیمانی کۆن) کە تەوراتە و (پەیمانی نوێ) کە ئینجیلە یەکدەخات و ئەوەی خوا ویستی لە چاکەو چاکەخوازی بۆ ئادەمیزاد لە داهاتووە دوورو درێژەکەیدا پێی دەبەخشێ و هەر بەمەش هەموو ئەوەی ئادەم کۆدەکاتەوەو ئەیانکاتە برایەکی یەکتر ناس و تەباو، لەسەر پەیمانی خوا بە یەك دەگەن . پەرت نابن بۆ کۆمەڵ و دەستەی جیاجیا، یا نەتەوەو ڕەگەزی جودای دژ بەیەك ، بەڵکو هەموو وەك بەندەی یەك خوای تاك و تەنها کۆدەبنەوە. هەر هەمووشیان دەست ئەگرن بەو پەیمانەی خوای باڵا دەست کە هەر لە بەرەبەیانی ژیانەوە نەگۆڕاوەو ناشگۆڕێت.

خوای مەزن ئەیەوێ بەنی ئیسرائیل ئەو باوەڕ نەهێنانەیان بەو پەیامە نوێیەی کە باوەڕی بە پەیامەکەی ئەوانیش هەیە ـ نەبێتە گۆڕینەوەی پاداشتی نەبڕاوەی ڕۆژی دواییان بە ژیانی کەمی دونیاو بەرژەوەندیە تەسکەکانی خۆیان ـ بە تایبەتی پیاوە ئاینیەکانیان (قەشەکانیان) کە ئەترسن لەوەی بە باوەڕهێنانیان سەرۆکایەتیەکانیان لەدەست بچێ. کە لە ڕێیەوە زۆر دەستکەوتی ناڕەوایان بەدەست ئەهێنا ، بۆیە بانگیان دەکات کە بە تەنها لەو بترسن و مل کەچی ئەوبن :

﴿ وَءَامِنُوا۟ بِمَآ أَنزَلْتُ مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُمْ وَلَا تَكُونُوٓا۟ أَوَّلَ كَافِرٍۭ بِهِۦ ۖ وَلَا تَشْتَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِى ثَمَنًا قَلِيلًا وَإِيَّٰىَ فَٱتَّقُونِ ﴿٤١﴾ ﴾ البقرة: ٤١

پارەو سامان و دەستکەوتە مادديەکان ... کە هەر لە کۆنەوە جوەکان خولیاو شەیدای بوون !! لەوانەشە مەبەستی لە دوورکەوتنەوەیان بێت لەو دەستکەوتەی کە سەرانی جولەکە دەستیان دەکەوت لەبری ئامۆژگاریە درۆینەکانیان و، گۆڕین و تێکدانی مانای یاسا ئاینیەکانیان تا گەورە پیاوان و دەوڵەمەندەکان بەدەر بن لە سزای تاوانەکانیان و نەکەونە بەر سزای کردەوە خراپەکانیان ، هەروەك لە جێگاکانی تری قورئاندا باسیان دەکات ، تا ئەم چالاکیانە هەر لە دەست خۆیاندا بمێنێتەوەو ڕێگا لە گەلەکەیان بگرن و نەیەڵن بچنە ناو ئاینی ئیسلامەوەو ببن بە موسوڵمان ، چونکە ئەوکاتە سەرۆکایەتی و سەروەریەکەیان لەدەست دەچێ... بەڵام ـ هەروەك هەندێ لە یارانی پێغەمبەرو شوێن کەوتوانیشیان ، خوایان لێ ڕازی بێت ، لە ڕاڤەکردنی ئەم ئایەتەدا ئەفەرموون ـ ژیانی دونیا هەرهەمووی نرخێکی کەمە ، کاتێ کە بەرامبەر ئایەتەکانی خوا دەپێورێ یا بەرامبەر ئاکامی باوەڕ و ئیمان بپێورێ لە ڕۆژی دوایی و لە پەنای خوای مەزندا.

هەروەها ڕەوتەکە بەردەوام دەبێت لە هۆشیارکردنەوە لەو فڕوفێڵانەی دەیکەن لە چەواشەکردن و تێکەڵاوکردنی ڕەواو ناڕەواو، شاردنەوەی ئەو ڕاستیانەی ئەیزانن بە مەبەستی تێکدانی بیرو بۆچوونەکان لە نێو کۆمەڵگای موسوڵمانداو، بڵاوکردنەوەی گومان و پشێوی لە نێوانیاندا:

﴿ وَلَا تَلْبِسُوا الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ وَتَكْتُمُوا الْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٤٢﴾ ﴾ البقرة: ٤٢

جوەکان لە هەر بۆنەیەکدا گەر بۆیان ڕەخسابێت ئەم جۆرە تێکەڵکردن و چەواشەکاری و شاردنەوەی ڕاستیانەیان کردووە بە پیشەو کردەوەی خۆیان، هەروەك قورئان لە زۆر جێگادا باسی ئەکات و هەردەم هۆکاری دووبەرەکی و پشێوی بوون لە کۆمەڵگای ئیسلامیداو بوونەتە مایەی تێکدان و گێرەشێوێنی لە ناو ڕیزەکانی موسوڵماناندا، کە لەمەو دواش زۆر لەم کردەوانەیان باسدەکرێت !

پاشان بانگیان ئەکات بۆ تێکەڵ بوون لەگەڵ کاروانی ئیمان و باوەڕو، چوونە ناو ڕیزەکانیانەوەو بەجێهێنانی ئەو پەرستشانەی بۆیان دانراوەو، وازهێنان لەو گۆشەگیری و دەمارگیریە ناشرینەی کە هەر لە کۆنەوە بۆتە سیماو مۆرکێك بە ناوچەوانی جولەکەکانەوە:

﴿ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَارْكَعُوا مَعَ الرَّاكِعِينَ ﴿٤٣﴾ ﴾ البقـــرة: ٤٣

دیسان ناڕازیە لەوەی کە ئەوان ـ بەتایبەتی مالومەکانیان بانگکارانی خەڵکی بن بۆ باوەڕهێنان بەخوای گەورە. گوایە هەر ئەمان خاوەن پەڕتووکی

پیرۆزو خاوەن پەیامی ئاسمانین لە ناو هاوبەشپەیداکاراندا، بەڵام لە هەمان کاتیشدا ڕێ لە میللەتەکەی خۆیان دەگرن کە باوەڕ بێنن بە ئایینی نوێی خوای گەورە ، ئەو ئاینەی کە باوەڕ بە ئایینە کۆنەکەی ئەوانیش ئەهێنێت :

﴿ ۞ أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ البقرة: ٤٤

لەگەڵ ئەوەی ئەم دەقە لە قورئان لەسەرەتاوە ئاڕاستەی ئاکارو ڕەفتارێکی بەنی ئیسرائیلی ئەکرد، بەڵام بەو کاریگەریانەی کە دەیکاتە سەر دەروونی ئادەمیزادو دەروونی پیاوانی ئایینی بە تایبەتی، بریتیە لە ئاڕاستەیەکی بەردەوام و گشتیی نەك تایبەت بەتەنها گەلێك یا بە تەنها نەوەیەك .

نەخۆشی پیاوانی ئایینی ـ کاتێ کە ئاین ئەبێت بە پیشەو کارێك نەك عەقیدەو باوەڕێکی گەرم و گوڕو بزوێنەر ـ ئەوەیە ، ئەوەی بەدەم ئەیڵێن لە ناو دڵیاندانیە ، فەرمان ئەدەن بە چاکە بەڵام خۆیان نایکەن ، بانگەواز ئەکەن بۆ چاکە خوازی و خۆیان پشتی تێدەکەن و،ماناو مەبەستی گوفتارەکان لار دەکەن و تێکی دەدەن و، دەقە ڕاستەوخۆکان بە ئارەزووی خۆیان لێك ئەدەنەوە بۆ خزمەت کردنی مەبەست و ئارەزوەکانیان و، هەندێك گوفتارو ڕاڤەی وا ئەدۆزنەوە کە بە ڕواڵەت لەگەڵ شێوەی دەقەکاندا یەکدەگرنەوە بەڵام لە ڕاستیدا جیاوازە لە مەبەستە ڕاستیەکانی ئاین ، هەر بۆ مەبەستی تێرکردنی ئارەزووی خاوەن پارەو دەسەڵاتداران! هەروەك مالومانی جولەکە دەیانکرد!

بانگەوازکردن بۆ چاکەخوازی و لە هەمان کاتدا نەکردنی و لادان لێی، لە ڕەوشتی بانگکاراندا نەخۆشیەکە دڵ و دەروون تووشی گومان دەکات نەك تەنها بەرامبەر بانگکاران بەڵکو بەرامبەر خودی بانگەوازەکانیش،

نەخۆشیەکە دڵ و بیری خەڵك تێك دەدات چونکە لەو کاتەی گوفتارێکی جوان دەبیستن لە هەمان کاتدا ڕەوشتێکی ناشرین ئەبینن ، ئالێرەدا لە نێوان گوفتارو ڕەفتاردا سەرسام ئەبن ، ئەو گرەی بیروباوەڕەکە لە نێو دڵ و گیانیاندا کردویێتیەوە دائەمرکێتەوەو کزدەبێت ، ئەو ڕۆشناییەی کە باوەڕو ئیمان لە دەروونیاندا پەخشی دەکات تاریکی بەسەردا دێ و نامێنێ، ئیتر لەو کاتەی کە باوەڕیان بە پیاوانی ئایینەکە نەما هیچ متمانەو باوەڕیان بە خودی ئاینەکەش نامێنێ.

هەر وشەیەکیش با زۆر گەورەو بزوێنەرو هەژێنەریش بێت ، گەر لە دڵێکەوە هەڵنەقولاً بێت کە خۆی باوەڕێکی توندو بەهێزی پێ نەبێت ئەوا بێ گومان بە مردوویی لە دایك دەبێ و زۆر بەبێ دەنگیش دەگاتە گوێگرانی، هیچ مرۆڤێکیش نیە باوەڕێکی ڕاستی بە وتەکانی خۆی هەبێت گەر خۆی نەکاتە نوێنەرێکی زیندووی گوفتارەکانی و، نەبێتە بەرجەستەیەکی ڕاستەوخۆی وتەکانی خۆی ... بۆیە تەنها لەم کاتانەدا خەڵکی باوەڕ دێنن و دڵنیا ئەبن با وتەکانیش بێ ڕەنگدانەوە بن و زۆر ڕازاوەش نەبن ، چونکە ئەو کاتە هێزو وزەی خۆی لە ڕاستی و دروستیەکەیدا وەرئەگرێت و نەك لە لەرینەوەو دەنگدانەوەیدا. جوانی خۆی لە ڕاستگۆییەکەیدا دەبینێ نەك لە بریق و هووڕیدا، هەر لەو کاتەشدا ئەبێتە بزوێنەری ژیان چونکە لە خودی ژیانەوە هەڵقوڵاوەو لەدایك بوە.

گونجان و لەیەك چوونی گوفتارو ڕەفتار، یا بیروباوەڕو کردار کارێکی وا ئاسان و سادە نیەو، ڕێگایەکی تەخت و پان و بەرین نیە. بۆیە پێویستی بە ڕاهێنان و هەوڵدان و ماندووبوون هەیە. پێویستی بە پەیوەندی بوونە بە خوای مەزنەوە ، پیویستی بە پەناگرتن و یارمەتی وەرگرتنە لە خوای باڵادەست و ڕێنمایی کردنی ئەوی دەوێت ، چونکە کێشەکانی ژیان و پێویستیەکانی و تەنگوچەڵەمەکانی زۆر جاران مرۆڤ دوورئەخەنەوە لەو

بیروباوەڕەی کە لە ناو ویژدانیدا جێگیر بوەو خەڵکی بۆ بانگەواز دەکات. جا کەسێك کە داهاتووی مردن و نەمان بێت گەر پەیوەندی بە هێزێکی نەمرو بەردەوامەوە نەکات ئەوا هەر بە لاوازی و بێ دەسەلاٌتی ئەمێنێتەوە با بە ڕواڵەتیش زەبەلاح بێت ، چونکە هێزەکانی شەڕو زۆرداری و چەواشەکاران لەو زۆر گەورەترو بە هێزترن . لەوانەیە چەند جارو چەند جار بەسەریاندا زاڵ بێت بەلاٌم هەرکە ساتێك لاوازی ڕووی تێکرد ئیتر سەر شۆڕ دەبێ و بەرەو هەڵدێر مل ئەنێ و ڕابووردو ئێستاو داهاتووشی ئەدۆڕێنێ... بەلاٌم بە پێچەوانەوە هەرکە پەنا بباتە بەر هێزی هەمیشە بەردەوام و ئەزەل ئەو کاتە بەهێزترین و بە تواناترینە و زاڵ ئەبێ بەسەر هێزی ڕاکێشکەری پێویستیەکانی و لە هێزی ڕوخێنەری تەنگ و چەڵەمەکانی بالاٌترەو. بەهێزترە لەو خاوەن هێزانەش کە بەرەو ڕووی دەبنەوە .

پاشان قورئان ئەو جولەکانەی کە یەکەم جار بەرەو ڕوویان دەبوەوەو هەموو خەڵکیش لەگەڵ ئەواندا، هەموویان هاندەدات بۆ پەنابردنە بەر ئارام گرتن و پەنابردنە بەر نوێژکردن ... وە دەربارەی جوەکان وا پێویست بوو لە سەریان کە ئەو پەیامە ڕاست و ڕەوایەی کە باشیش ئەیانناسی ئەبوایە زۆر باشتر بوایە بەلایانەوە لەو پلەوپایە تایبەتیەی کە هەیانبوو لە شاری مەدینەداو، باشتر بوایە لەو نرخ و سامانەی وەریان ئەگرت لە خەڵکی ـ جا گەر نرخی خزمەتگوزاریە ئاینیەکان بێت یا نرخی دونیا هەمووی بێت ـ ئەبوایە بچنە ناو کاروانی ئیمان و باوەڕەوە ، چونکە هەر خۆیان بوون کە خەڵکیان بانگ ئەکرد بەرەو ئیمان و باوەڕ! ئەم کارەش بێ گومان ئازایی و تواناو لێبووردوویيەکی دەویست ، پەنابردنە بەر ئارام گرتن و نوێژکردنی ئەویست:

﴿ وَاسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلَاةِ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى الْخَاشِعِينَ ﴿٤٥﴾ الَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَاقُو رَبِّهِمْ وَأَنَّهُمْ إِلَيْهِ رَاجِعُونَ ﴿٤٦﴾ ﴾ البقرة: ٤٥ - ٤٦

وا دیاره ئەو جێناوەی لە وشەی ( إنها ) دایە جێناوی ( شأن )ە، یانی ئەم بانگەوازکردنە بۆ دانپیانان بەو پەیامە ڕاست و ڕەوایە لە ڕووی ئەم هەموو هۆکارانەدا، زۆر گەورەو دژوارو گرانە ، تەنها بۆ ئەو کەسانە نەبێت کە مل کەچی فەرمانەکانی خوای گەورەن و لە خوا ئەترسن و خۆیان لە گوناه ئەپارێزن ، ئەوانەی دڵنیان و بێ گومانن لەوەی کە لە ئاکامدا بە خوای خۆیان دەگەنەوەو هەر بۆ لای ئەو ئەگەڕێنەوە.

پەنابردنە بەر ئارام گرتن زۆرجار لە قورئاندا دووپات دەبێتەوە چونکە بریتییە لەو توێشووەی کە هەر دەبێ هەڵبگیرێت بۆ بەرەنگاربوونەوەی ناخۆشیەکان ، کە یەکەمینیان گرفتی وازهێنانە لە سەرۆکایەتی و سەروەری و، قازانج و دەستکەوتەکان ، کە وەك ڕێزلێنانێك بۆ ڕاستیی و هەق و ڕەوار شوێنکەوتنیان و، دانپیانانێك بەو ڕاستیانەداو مل کەچکردنە بۆیان ...

ئەی پەنا بردنە بەر نوێژکردن چییە؟

نوێژ پەیوەندی و بەیەکگەیشتنێکە لە نێوان بەندەو پەروەردگاردا. پەیوەندیەك دڵ و دەروون بە هێز ئەکات و، گیانیش هەست بەو پەیوەندیەی دەکات و، دەروونیش توێشوویەکی وای تیا ئەبینێ کە لە زۆر لە بەرهەمەکانی ژیانی دونیای بە نرخترو بڵندترە ...

پێغەمبەر (ﷺ) گەر گرفتێك زۆری بکردایە هەر زوو پەنای ئەبردە بەر نوێژکردن ، لەگەڵ ئەوەی کە ئەوی ڕێزدار هەر خودی خۆی پەیوەندیەکی زۆر پتەوی لەگەڵ پەروەردگاریدا هەبوو، گیانی پاکیشی بە سرووش و نیگاوە نزیك و بەند بوو... وە تا ئێستاش ئەم سەرچاوەو کانیاوە بەخوڕە

لەبەر دەستی هەموو موسوڵمانێك دایە گەر توێشووی ڕێگای مەبەست بێ و، هەردەم بیەوێ لە قرچەی گەرمادا گەرووی هەردەم تەڕو پاراوبێ و، گەر یارمەتی بوێ لەو ساتانەی یارمەتی لێ دەبڕێ و سامان و یەدەكێك بێت بۆی لەو ساتانەی سامان و داهاتی لێدەبڕێت ...

دڵنیا بوون بە دیدارو بینینی خوای گەورە ـ بەكارهێنانی زاراوەی گومان بردن و ئەو ئەگەرانە لە مانای دڵنیابووندایە زۆر هاتووە لە قورئاندا بە تایبەتی و لە زمانی عەرەبیشدا بە گشتی ـ كە دڵنیابوونە بە گەڕانەوە تەنها بۆ لای خوا لە سەرجەم كارو فرمانەكاندا... ئەوە مانای تەواوی ئارامگرتن و هێمنیەو مانای تەواوی پێوانەی ڕاستی بەهاكانە ، بەهای دونیاو بەهای ڕۆژی دوایی ، هەر كاتێكیش پێوانەی ڕاست و تەواو بەكارهات بۆ ئەم بەهایانە ، دونیا زۆر بەبێ نرخ دێتە پێش چاوان و، بریتی دەبێت لە بەرهەمێكی لاوازو، ڕۆژی دوایش لە شێوەی ڕاستەقینەی خۆیدا دەردەكەوێت. بە شێوەیەك كە هیچ مرۆڤێكی خاوەن بیرو هۆش دوودڵ نابێت لە هەڵبژاردنی و بەباشتر زانینی بەراورد لەگەڵ ژیانی سەرزەویدا.

هەر بەو شێوەیە ئەوەی باش لە قورئان بكۆڵێتەوەو تێی بگات ، تێدەگات ئەو ئاڕاستەیەی كە یەكەم جار مەبەست لە بەنی ئیسرائیل بوو، هەرئەوە ئاڕاستەیەكی بەردەوام و نەبڕاوە بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی...

* * *

دیسانەوە گەڕانەوەیەك بۆ بانگكردنی بەنی ئیسرائیل و، بیرخستنەوەی باراندنی بەهرەكانی خوای گەورە بەسەریانداو، تۆقاندنیان بە سزاكانی ئەو ڕۆژە سامناكەی چاوەڕێیان دەكات ، بە شێوەیەكی كورت و پێش درێژە پێدانی دێت ، كە ئەفەرمووێت :

﴿ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ وَأَنِّي فَضَّلۡتُكُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٤٧﴾ وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا لَّا تَجۡزِي نَفۡسٌ عَن نَّفۡسٖ شَيۡـٔٗا وَلَا يُقۡبَلُ مِنۡهَا شَفَٰعَةٞ وَلَا يُؤۡخَذُ مِنۡهَا عَدۡلٞ وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾ البقرة: ٤٧ - ٤٨

پیاهەڵدان و بە باشداناني بەنی ئیسرائیل لە چاو هەموو خەڵکیدا تایبەت بوو بە کاتی هەڵبژاردنیان و کاتی جێنشینیان لەسەر زەوی ، بەڵام هەرکە لە فەرمانەکانی خوا لایانداو سەرپێچی پێغەمبەرەکانیان کردو، نازو بەهرەکانی خوایان لەبەر چاو نەگرت و، پابەندی پەیمانەکانیان نەبوون . لەو کاتانەدا خوای باڵادەست فەرمانی خۆی دەرکرد بە نەفرەت لێکردن و تووڕەبوون و بڕیاردانی سەرشۆڕی و دوڕاوی بۆیان . بڕیاری ئاوارەبوون و سەرلێشێوانی بۆ دەرکردن و هەڕەشەی ئاگری سەختی دۆزەخیشی لێکردن لە ڕۆژی دواییدا . وە بیرهێنانەوەی پلەوپایەی ڕابردوویان لە بەرامبە خەڵکانی تردا بۆ ئەوە بوو بیریان بخاتەوە کە چەند چاکەو بەخششی خوایان گەورەیان بەسەرەوە بوو، وە چ پەیمانێکی دابوونێ و، هانیاندەدا تا ئەم هەلەشیان لەدەست نەچووە لەسەر دەستی ئەم بانگەوازە ئیسلامیەدا ، دەبا بگەڕێنەوە بۆ کاروانی ئیمان و باوەڕو، بۆ پەیمان و بەڵێنی خوای گەورە. وە سوپاسگوزاری ئەوەش بن کە لەمەو پێش باوباپیرانیانی ناودارو پایەدار کردووەو، گەڕانەوەیەکیش بێت بۆ ئەو پلەو ڕێزلێنانەی کە باوەڕداران هەمووکات دەستیان دەکەوێت .

هاوکـــات لەگـــەڵ چـــاو برینـــە نـــازو بـــەهرەو بەخـــشش، بەدوایـــدا ئاگادارکردنەوە لەو ڕۆژە دێت کەوا باسی لێدەکرێت:

﴿ ولاتجزي نفس عن نفس شيئا ﴾...

ئەرکەکان تاکەکەسین و، لێپرسینەوەش کەسایەتیەو، هەر مرۆڤـێك تـەنها لـە خـودی خـۆی بەرپرسـیارەو، هـیچ کەسـێك بـە فریـای کەسـی تـر ناکـەوێ... ئـا ئەوەیـە بیروبـاوەڕی مـەزنی ئیـسلام... بیروبـاوەڕی ئـەرکی تاکەکەسـی کـە بەنـدە لەسـەر ویـستی جیاکردنـەوەو هەڵبـژاردن لـە لایـەن ئـادەمیزاد خۆیـەوەو، بەنـدە لەسـەر دادپـەروەری ڕەهـای خـوای گـەورە. کـە ڕاستترین بیروباوەڕێکە وا لە مرۆڤ بکات هەست بە نرخ و بەهای خۆی بکات کـە هانـدەرێك بێـت بـۆ وریـایی و هۆشـیاری بـەردەوام لـە ویژدانیـدا، کـە هەریەکەیان هۆکارێکن لە هۆکارەکانی پەروەردەکردن ، سەرەڕای ئەوەی کە بەهایـەکی مرۆڤـایەتیە و دەخرێتـە سـەر ئـەو نـرخ و بەهایانـەی کـە مایـەی ڕێزلێنانێتی لە ئاییني ئیسلامدا.

﴿ ولا يقبل منها شفاعة. ولايؤخد منها عدل ﴾.

ئـیتر هـیچ پاڕانەوەیـەك بـۆ لێخۆشـبوون لـەو سـات و ڕۆژەدا سـوودی نابێت گەر ئیمان و باوەڕو کردەوەیەکی چاکی لەگەڵدا پێشکەش نەکرێت و، هـیچ بارمتەیـەکیش لـە بـری چاوپۆشـین لـە گونـاە و خراپەکاریـەکانیان لـێ وەرناگیرێت .

﴿ ولاهم ينصرون ﴾...

هیچ پشتیوانێك نیه بیانپارێزێ له سزای خوا یا ڕزگاریان كات له سزاو ئەشكەنجەدان ... وه لێرەدا بۆیه به كۆ دەریئەبڕێ چونكه مەبەستی له كۆمەڵه دەروونەكانه ، كه هیچ كامیان به كەڵكی ئەوی تریان نایەن و، بوار بۆ پاڕانەوەیان نادرێ و، بارمتەیان له بری لیٚ وەرناگیرێ ، وه له سەرەتای ئایەتەكەشدا كه به شێوازی نادیار بەرامبەریان ئەدوێ هەر بۆ مەبەستی گشتگیریه ، چونكه ئەمه پاساوو بڕیارێكی هەمه لایەنەیەو، سەرجەم ئەوانەی لەگەڵیان ئەدوێ و خەڵكانی تریش هەر هەموویان ئەگرێتەوه .

*        *        *

جوزئی یەكەمی قورئان كۆتایی هات ....